# سەلەفیەت و
# مۆدێلێکی تری
# بیدعە!!



نوسینی
علی محمد هێرۆیی

بسم الله الرحمن الرحيم


**ناوی کتێب**

سەلەفیەت و مۆدێلێکی تری بیدعە

**ناوی نووسەر**

علی محەمەد احمد

**تیراژ**

١٠٠٠ دانە

**ژمارەی سپاردن لە لایەن بەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتی یەکان**

(١٣٢٣)

**ساڵی چاپ**

٢٠١٤

چاپ و تەجلیدی ڕێ نوێ

# پێشکەش کردن

* ئەم کتێبە پێشکەشە بە هەر موسڵمانێکی خۆشەویست کە بە شێوەیەکی دروست شوێن سەلەفی صالحی ئەم ئوممەتە دەکەوێت و شوێنکەوتنی سەلەفی ئوومەت تەنها لە ناوی سەلەفی و ڕیشی درێژ و پانتۆڵی کورتدا کورت ناکاتەوە!!

* پێشکەشە بەو گەنجە خۆشەویستانەی کە عاشقی سوننەتی پێغەمبەرن ﷺ و عەودالن بۆ دۆزینەوەی ڕێگایەکی ڕاست بۆ ئەوەی لەڕێیەوە وەکو سەلەفی صالح سوننەتەکانی پێغەمبەرﷺ جێبەجێ بکەن.



# پێشەکی

الْحَمْدُ لِلّٰهِ نَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوذُ بِاللّٰهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا مَنْ يَهْدِهِ اللّٰهُ فَلَا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلَا هَادِيَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُـــــــــــهُ.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللّٰهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ ﴾(آل عمران: ١٠٢)

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللّٰهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللّٰهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾(النساء: ١)

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللّٰهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعْ اللّٰهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾(الأحزاب: ٧٠-٧١)

أما بعد:

خودای گەورە شاهیدە تا ئێستا نە ئەندامم لە هیچ حیزبێکدا، وە نە پەیوەستم بە هیچ ڕێڕەو طـەریقتێکەوە، بەڵام هەر کەسێك بڵێت: (لا إله إلا الله، محمدٌ رسول الله) ئەوە من خۆشم دەوێت، وە هەر کەسێکیش دژی ئەم ووشانە ئیش بکات ڕقم لێیەتی، وە ئەم کتێبەی لەبەر دەستی بەڕێزیشتان دایە نە بۆ ئەستۆ پاکی حیزب و گروپ و ڕێڕەو و طـەریقەتێك نوسراوە، وە نە بۆ دژایەتی هیچ گروپ و حیزب و ڕێڕەوێکی تر، بەڵکو تەنها چەند ڕونکردنەوەیەك و خستنە ڕوی چەند ڕاستیەکە کە پێویستە موسڵمانان بیزانن، جا بیرۆکەی نوسینی ئەم کتێبە لەوەوە سەرچاوەی گرت، کاتێك سەیری کتێب و نوسین وکەناڵەکانی سەلەفیەکانم دەکرد، دەم بینی بەڕاستی زۆر بە بێ ویژدانی زەمی حیزب و گروپ و ڕێڕەو و طـەریقەتەکانی تری ئیسلامیان دەکرد، بەشێوەیەك حەقی ڕەهایان بە خۆیان دابوو و ئەوانی بەرامبەریشیان هەموویان بە مبتدع و لادەر لە شاڕێی ئیسلام ئەژمار دەکرد، جا من لەم کتێبە بچکۆلانەی بەر دەستی ئێوەی بەڕێزدا دەمەوێت بڵێم، خوێنەری بەڕێز: دەبێت بزانیت کە حەقی ڕەها تەنها لای خودای پەروەردگارە، جگە لە ئەو زاتە هیچ

کەسێك نابێت لافی حەقی ڕەها لێبدات و بەرامبەرەکانیشی بە ڕەهایی بە بیدعە و بیدعە چی بزانێت، دەبێت ئەوە بزانیت تەنها خودای پەروەردگار صیفەتی کەمالی هەیە و جگە لە ئەو هیچ کەسێك و گروپێك ئەم صیفەتەیەی نیە و نابێت بۆ خۆیشی بە ڕەوا ببینێت، وە دەبێت بزانیت ئەگەر مەزهەب و حیزب و طـەریقەتەکانی تری ئیسلام بیدعە و بیدعە چی بن ئەوە بێگومان سەلەفیەکانی ئەمڕۆش پشکی شێریان لە بیدعەو بیدعە چیەتی بەرکەوتووە، بەڵام ئەوان بە مۆدێلێکی تر و لەژێر پەچەی ڕووبەڕووبونەوەی بیدعەدا بیدعەکانی خۆیانیان شاردوتەوە، جا بۆ چونە ناو باسەکەم سەرەتا پێناسەی بیدعە دەکەین و پاشان چەند بنچینە و مقدمەیەك باس دەکەین کە سەلەفیەکان لەسەر ئەم بنچینە و مقدمانە کردەوەکانی موسڵمانان بە بیدعە دادەنێن پاشان هەمان ئەو بنچینەو مقدمانە لەسەر خۆیان جیبەجێ دەکەین . ان شاء الله.

زانایانی ئەهلی سوننەت و جەماعە بیدعە دەکەن بە دوو بەشەوە: بیدعەی چاك و بیدعەی خراپ ، وە پێناسەی بیدعەی خراپ بەوە دەکەن کە: بریتی لەهەر شتێك کە لە دوای پێغەمبەری خوداﷺدا لە دیندا دابهێنرێت و هیچ بەڵگەیەکیشی نەبێت لە بەڵگەکانی (مصادری تشریعی

ئیسلامی) وە یاخود دژ بوەستێت لەگەڵ یەکێك لە بەڵگەکانی مصادری تشریعی ئیسلامی کە بریتین لە: قورئان و سوننەت و إجماع و قیاس و استحسان و استصحاب و مصالح مرسلە و عورف و عادەت و قەولی صحابی و سد الزرائع و شرع من قبلنا.

بەڵام هەر کردەوەیەکی چاك دابهێنرێت و پیشتیوانیشی هەبێت لە (مصادر تشریع إسلامی) ئەوە پێی دەگووترێت: بیدعەی چاك، ئەمەش بەبەڵگەی فەرموودەی پێغەمبەرﷺ کە فەرموویەتی: (مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمرِنا هذا ما لَيسَ مِنهُ فَهُوَ رَدٌ)بوخاری گێراویەتەوە..واتا هەر کەسێك کردەوەیەك دابهێنیت و فەرمانی خودا و پێغەمبەریﷺ لەسەر نەبێت و هیچ بنچینەیەکی نەبێت لە شەرعدا ئەوە ڕەت دەکرێتەوە. پێشەوا ابن ڕەجەب رحمه الله دەفەرموێت: ئەم فەرموودەیە مەفهومی موخالەفەکەی ئەوە دەگەیەنێت کە هەر کردەوەیەك دابهێنرێت و بەڵگەو پشتیوانی هەبێت لە شەرعدا ئەوە وەردەگیرێت.

وە پێشەوا ابن حجری عەسقەلانی رحمه الله دەفەرموویێت: ئەو کردەوانە دەگرێتەوە کە هیچ بەڵگەیەکیان نیە لەشەرعدا نە لە ڕوی گشتیەوە، وە نە لە ڕوی تایبەتیەوە.(فتح الباري: ١٣/٣١٢)

وە پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (مَنْ سَنَّ فِي الإِسلامِ سُنَّةً حَسَنَةً كانَ لَهُ أَجرُها وَأَجرُ مَنْ عَمِلَ بِها مِنْ بَعدِهِ لا يَنقُصُ ذلكَ مِنْ أُجُورِهِم شَيئاً، وَمَنْ سَنَّ فِي الإِسلامِ سُنّةً سَيئةً كانَ عَلَيهِ وِزرُها وَوِزرُ مَنْ عَمِلَ بِها مِنْ بَعدِهِ لا يَنقُصُ ذلكَ مِن أَوزارِهِم شَيئاً)(مسلم گێڕاویەتەوە)

واتا: هەر کەسێك سوننەتێك و کردەوە و ڕێڕەوێکی جوان دابهێنێت لە ئیسلامدا، ئەوە خێری خۆشی و خێر ئەو کەسانەشی بۆ دەنوسرێت کە لە دوای خۆی ئیشی پێدەکەن، بێ ئەوەی لە خێری هیچ کامێکیشیان کەم بێتەوە، وە هەر کەسێك سوننەت و کردەوە و ڕێڕەوێکی خراپ دابهێنێت، ئەوە خراپەی خۆشی و ئەو کەسانەشی بۆ دەنوسرێت کە لە دوای خۆی کاری پێدەکەن، بێ ئەوەی لە خراپەی هیچ کامێکیشیان کەم بێتەوە.

بەڵام برایانی سەلەفی پێناسەی بیدعە بەوە دەکەن کە بریتیە: لە هەر کردەوەیەك کە لە دوای پێغەمبەرﷺ و هاوەڵان داهێنرابێت و هیچ

بەڵگەیەکیشی نەبێت لە قورئان و سوننەت ـ یاخود لە قورئان و سوننەت ئاماژەی پێنەکرابێت ـ و بدرێتە پاڵ دین، وە لەسەردەمی پێغەمبەرﷺ و هاوەڵان زەمینە لەبار بوبێت و داخوازیشی هەبوو بێت بۆ ئەنجام درانی بەڵام ئەنجام نەدرابێت.

وە یەکێك لە مەلای سەلەفیەکان کاتێك لە کەناڵی ئامۆژگاری نمونەی بۆ ئەم پێناسەیە دەهێنایەوە دەیگووت: بۆنمونە مەولودی پێغەمبەرﷺ:

ـ ئایا داهێنراوە یان نا؟ وەڵام: بەڵێ داهێنراوە.

ـ ئایا دەدرێتە پاڵ دین یان نا؟ وەڵام: بەڵێ دەدرێتە پاڵ دین.

ـ ئایا لە هیچ ئایەت و فەرموودەیەکدا ناوی هاتووە و ئاماژەی پێکراوە؟ وەڵام: نەخێر.

ـ ئایا لەسەردەمی سەلەفدا زەمینە لەبار بووە بۆ ئەنجامدانی؟ وەڵام: بەڵێ.

ـ ئایا سەلەف کردوویانە؟ وەڵام: نەخێر.

- ئایا خەڵکی بە کارێکی چاکی دەزانن یان نا؟ وەڵام بەڵێ بە کارێکی چاکی دەزانن.

- ئایا پێغەمبەرﷺزانیویەتی ئەم کارە چاکە یان نا؟ دوو وەڵامی هەیە:

یەکەم/ کە بڵێی زانیویەتی" ئێمەدەڵێین: ئەی بۆ نەیکردووەو ئومەتەکەشی لێ ئاگادار نەکردوتەوە،کەواتا:خیانەتی لە پێغەمبەرایەتیەکەی کردووە!!

دووەم/ کە بڵێی نەخێر نەیزانیوە، ئەوە کافر دەبیت، چونکە صیفەتی جەهل دەدەیتە پاڵ پێغەمبەرﷺ وە خۆت پێ لە پێغەمبەرﷺزاناترە لە کاتێکدا ئەو وەحیشی بۆ هاتووە،

کەواتا: مەولود کارێکی خراپە ، ئەگەر خەراپ نەبوایە پێغەمبەرﷺ دەیکردو ئومەتەکەشی لێ ئاگادار دەکردەوەو سەلەفی صالحیش دەیانکرد!

ئێمەش لەسەر هەمان ئەم بنچینە و موقەدیمانەی ئەوان شیکاری بۆ ناوی سەلەفی و مەزهەبی سەلەفیەکان دەکەین و دەڵێین:

* ئایا بانگەشە بۆسەلەفیەت و مەزهەبی سەلەفیەت داهێنراوە یان نا؟

وەڵام: بەڵێ داهێنراوە و بۆ یەکەمجار ئەم ووشەیە دوای داگیر کردنی میصر لە لایەن بەریتانیەکانەوە لە ساڵی ١٨٨٢ز بەکار هاتووە.

* ئایا سەلەفیەت دەدرێتە پاڵ دین؟ وەڵام: بەڵێ دەدرێتە پاڵ دین و خۆیان بەڕاستترینی فیرقەی موسڵمانان دەزانن.

* ئایا لە هیچ ئایەت و فەرموودەیەکدا خودا و پێغەمبەرﷺ فەرمانمان پێدەکەن سەلەفی بین، وە یاخود خودا و پێغەمبەرەکەیﷺ ئەم ئومەتەیان بە ئومەتێکی سەلەفی ناو بردووە؟ وەڵام: نەخێر.

* ئایا لەسەردەمی سەلەف زەمینە لەبار بووە و داخوازی هەبووە بۆ ئەوەی مەزهەبێك پەیدا ببێت بە ناوی سەلەفی؟

وەڵام/ بەڵێ: لە زۆر کاتدا داخوازی هەبووە بۆ ئەوەی لە ناو موسڵمانانی پێشینەی ئومەت گروپێك پەیدا ببێت بە ناوی سەلەفی و بانگەشە بکەن بۆ گەڕانەوە بۆ پێشینەکانی خۆیان، وەك سەردەمی فیتنەی نێوان هاوەڵان و شەهید کردنی پێشەوا عثمان رضي الله عنه و پەیدا بوونی خەواریج و قەدریەکان و ...وە زەمینەش لەبار بووە.

* ئایا لەگەڵ بوونی داخوازی و زەمینەی لەباریش هیچ کەسێك هات لە سەردەمی پێشینەی ئوممەت بڵێت: من سەلەفیم یان گروپ و فیرقەیەك دروست بکات بە ناوی سەلەفیەت و بانگەشەی بۆ بکات؟ وەڵام: نەخێر.

* ئایا خەڵکی سەلەفیەت بە کارێکی خێر و چاك دەزانن یان خراپ؟ وەڵام/ بێگومان بە چاکی دەزانن، ئەگەر بە چاکیان نەزانیبایە دوای نەدەکەوتن،

* ئایا پێغەمبەرﷺ بەم کارە چاك و خێرەی زانیوە یان نا؟ دوو وەڵامی هەیە:

یەکەم/ کە بڵێیت: بەڵێ ،ئێمەش دەڵێین: ئەی بۆ پێغەمبەری خوداﷺ ئوممەتەکەی لەم کارە چاکە ئاگادار نەکردۆتەوەو نەیفەرمووە بچۆنە ناو حیزب و مەزهەبی سەلەفیەکانەوە، کەواتا پێغەمبەرﷺ خیانەتی کردوە لە ڕاگەیاندنی ئەم دینە!!

دووەم/ کە بشڵێی نەخێر نەیزانیوە، ئەوە کافر دەبیت ،چونکە چۆن کارێکی خێر هەبێت پێغەمبەری خوداﷺ نایزانێت، ئەوە تۆ صیفەتی

نەزانی دەدەیتە پاڵ پێغەمبەرﷺ لە کاتێکدا لەلایەن خوداوە وەحی بۆ دێت ، کەواتا تۆ ئەم نەزانیە دەدەیت پاڵ خوداش، نعوذ بالله.

دەر ئەنجام/ جا ئەگەر مەزهەبی سەلەفیەت باش بوایە ئەوە لە قورئان و سوننەتدا ناویان دەهات و پێغەمبەریشﷺ ئێمەی لێ ئاگادار دەکردەوەو پێشینەی ئوممەتیش حیزب و مەزهەبێکیان دروست دەکرد بە ناوی سەلەفیەت، جا کە نەیانکردووە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ناو لەخۆ نان بە سەلەفی و مەزهەبی سەلەفیەت بیدعەیەکی خراپە.

جا بەپشتیوانی خودا ئێمە ئەم بنچینانە و مقدمانە زیاتر ڕون دەکەینەوە و لە چەند جێباسێکدا ڕونی دەکەینەوە و دەیسەلمێنین کە بانگەشە بۆ سەلەفیەت و ناو لە خۆتان بە سەلەفی و مەزهەبی سەلەفیەت بیدعەیەکی خراپە ، وە سەلەفیەت تەنها بە دروشم نیە بەڵکو کرداری گەرەکە، وە بەشێك لە بیدعەکانی ئەم سەلەفیانە باس دەکەین.



# جێباسی یەکەم/خودای گەورە جل جلاله ناوی ئەم ئوممەتەی پێغەمبەری ﷺ نەبردووە بە ئوممەتێکی سەلەفی" بەڵکوو بەچەندین ناوی تر ناوی بردووە، لەوانە:

١ـ خودای گەورە ئەم ئوممەتەی ناو بردووە بە موسڵمان ـ مسلم ـ خودای پەروەردگار دەفەمویێت: ﴿هُوَ سَمَّاكُمُ الْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ﴾ (الحج: ٧٦) واتا: خودای گەورە پێشتر ناوی ئێوەی ناوە بە موسڵمان، وە لەم قورئانەشدا بەهەمان شێوە بە موسڵمان ناوی بردوون. جا لێرەدا خودای گەورە نافەرموویێت: (هو سمّاكم سلفيين)بەڵکو دەفەرموویێت:﴿هُوَ سَمَّاكُمُ الْمُسْلِمِينَ﴾ ئەو ناو نانەش ناو نانی خودایە بۆ ئوممەتی ئیسلام!!

٢ـ المؤمن: خودای پەروەردگار لە چەندین جێگادا ئێمەی بە (يا أيها الذين آمنوا، وە أيها المؤمنون...) بانگ کردووە، بۆ نمونە: خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَائِمٍ ذَٰلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾ المائدە: ٥٤. واتا: ئەی ئەو کەسانەی

باوەڕتان هێناوە هەر کەسێك لە ئێوە لە ئیمان وباوەڕەکەی پاشگەز ببێتەوە ئەوە هەر خۆی زەرەر دەکات، چونکە خودای گەورە لە جێگای ئەوان گەلێك و خەڵکانێك دێنێتە کایەوە کە باوەڕێکی دامەزراویان هەیە و خودا خۆشی دەوێن و ئەوانیش خودایان خۆش دەوێت،هەروەها ملکەچ و فەرمانبەردار و دڵسۆزن بەرامبەر موسڵمانان، وە سەر بڵند و دەرون بەرزن بەرامبەر بێباوەڕان، وە لە پێناوی خودادا هەوڵ و تێکۆشان دەکەن و دەجەنگن و لە لۆمەی لۆمەکارانیش ناترسن،ئەمەش فەزڵ و ڕێزی تایبەتی خودایە دەیبەخشێت بە هەر کەسێك کە خۆی بیهەوێت و شایستە بێت، وە خودای گەورەش فراوان گیر و زانایە بە هەموو نهێنی و ئاشکرایە. وە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أُولَئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾البقرە:٨٢. واتا: ئەو کەسانەی باوەڕیان هێناوە و کردەوەی چاکە دەکەن ، ئائەوانە نیشتەجێی بەهەشتن و بە هەتا هەتایی تێیدا دەمێننەوە.

جا لێرەدا خودای گەورە نەیفەرمووە: (والذین قالوا إنا سلفیا..)واتا: ئەوانەی دەڵێن ئێمە سەلەفین و تەنها سەلەفیەکان ئەهلی بەهەشتن" بەڵکو دەفەرموێت: (والذین آمنوا..) ئەوانەی باوەڕدارن، باوەڕداریش

سەلەفیش و جگە لە سەلەفیەکانیش دەگرێتەوە و خۆ جیاکردنەوەی ناوێت.

٣ـ أمة وسطا: خودای پەروەردگار ئەم ئوممەتی بە میانڕەو(وسطاً) ناو بردووە و دەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا﴾البقرة: ١٤٣،واتا: بەم شێوەیە ئێوەمان گێڕاوە بە ئوممەتێکی ناوەند گیر و میانڕەو.

٤ـ خیر الأمة: خودای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ﴾آل عمران: ١١٠. واتا: بەڕاستی ئێوە چاکترین ئوممەتێکن کە بۆ سودی خەڵکی هێنراونەتە مەیدان ، چونکە بانگەواز دەکەن بۆ چاکە و نکوڵی دەکەن لە خراپە و باوەڕێکی دامەزراو بە خودا دەهێنن.

٥ـ الحنفیة السمحة: دینی لێبوردەی و لاری لە پوچ: پێغەمبەری خوداﷺفەرموویەتی:(بُعِثتُ بالحَنِفيَّةِ السَمحَةِ)(احمد گێڕاویەتەوە)واتا:خودای گەورە منی ناردووە بە دینی لێبوردەیی و لاری لە پوچ و خراپەکاری.

جا ئەمانەی ڕابران چەند ناوێکی ئوممەتی ئیسلام بوون لە قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەرداﷺ، وە لە قورئانی پیرۆزدا هیچ دەقێکمان نیە کە خودای گەورە بفەرموێت: (کنتم أمة سلفاً وە یان کونوا سلفیاً)

جا ئەگەر هیچ دەقێکمان نەبێت لە قورئاناندا ئوممەتی ئیسلام بە ئوممەتێکی سەلەفی ناو ببات" ئایا سەلەفیە دەق ڕەوەکان ئەم ناوەیان لەکوێوە هێناوە؟ چونکە کاتێك لەگەڵ برایەکی سەلەفی قسە دەکەیت وە یاخود برا سەلەفیەکان کاتێك لە کەناڵێکی ڕاگەیاندن دەردەکەون" زۆر جەخت دەکەنەوە لەسەر دەق، بەرامبەرەکەیان هەر شتێك بڵێت" پێیی دەڵێن: بەڵگەیەکمان بۆ بێنە لە قورئان و سوننەت!! ئێمەش لێرەدا هەمان پرسیار و هەمان داوا لە برا سەلەفیەکان دەکەین و دەڵێین: برایانی سەلەفی ئایا ئێوە بەڵگەتان چیە کە ناوتان لە خۆتان ناوە سەلەفی؟ ئەگەر ئێوە بەڕاستی لەسەر حەقن و بانگەشە بۆ حەق دەکەن و دیفاع لە سوننەت دەکەن و دژی بیدعەن" دەفەرموون تەنها بەڵگەیەکمان بۆ بێنن کە لە قورئاندا خودای گەورە بیفەرموێت: ئێوە سەلەفی بن !! بێگوومان دەستتان ناکەوێت، کەواتا ئەو ناوەی ئێوە بیدعەیە ، لە ژێر ناوی بیدعەشڕا بانگەشە بۆ سوننەت ناکرێت، چونکە: وەك خۆتان دەفەرموون: لەهەر شوێنێك بیدعەیەك هەبێت لەوێ سوننەت فەوتێنراوە و مرێندراوە!!



# جێباسی دووەم/ هیچ دەقێکمان لە سوننەتیش دا نیە بفەرمووێت: سەلەفی بن!!

هەروەك چۆن لە قورئاندا هیچ دەقێکمان نەبوو کە بە ئێمە بفەرمووێت: دەبێت سەلەفی بن" بەهەمان شێوە لە فەرموودەکانی پێغەمبەریشدا نەهاتووە کە ئەم ئومەتەی بە ئومەتێکی سەلەفی ناو بردبێت، وە لە هیچ فەرموودەیەکدا نەهاتووە پێغەمبەری خوداﷺ فەرمانمان پێبکات بەوەی سەلەفی بین، وە کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ باسی ئاشوب و فیتنەکانی ناو ئوومەتەکەی دەکات" فەرمانمان پێناکات بۆ ئەوەی ببین بە سەلەفی، بەڵکو فەرمانمان پێدەکات بەوەی کە لەگەڵ(سواد الأعظم و جماعة)واتا: زۆرینەی موسڵمانان دابین:

* ئەنەسی کوڕی مالكرضي الله عنه دەفەرمووێت: گوێم لە پێغەمبەری خوداﷺ بوو دەیفەرموو: (إنَّ أُمَّتي لا تَجتَمِعُ عَلى ضَلالةٍ ، فَإذا رَأَيتُم اِختِلافاً فَعَلَيكُم بِالسَّوادِ الأعظَمِ)(پێشەوا ابن ماجە گێڕاویەتەوە)واتا: بێگومان هیچ کاتێك ئومەتەکەم لەسەر گومڕایی کۆ نابنەوە، جا کاتێك کێشەو

جیاڕایی و ئاشوبتان بینی لە ناو ئومەتدا" ئەوە بچنە پاڵ زۆرینەی موسڵمانانەوە. بێگومان ئێستاش سەلەفیەکان کەمینەیەکی زۆر کەمینەن لە کوردستان و جیهانیشدا،وە بە زۆری لە چەند وڵاتێکی خەلیج دا بوونیان هەیە، هەموو مێژوو ناسێکیش دەزانێت کە زۆرینەی وڵاتانی خەلیج لە ژێر چاودێری ئینگلیز و لە پاداشتی ڕازیبونیان بە بوونی دەوڵەتی ئیسرائیلی جولەکە لە خاکی ئیسلامدا دروست بوون!!
(بڕوانە بۆ کتێبی ڕۆڵی عەلمانیەت لە مەینەتی گەلی کورد:١٢٩)

* پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (عَلَيكُمْ بِالجَماعَةِ فَإِنَّ الذِّئبَ لا يَأكُلُ مِنَ الغَنَمِ إلا القاصِيَةَ)(پێشەوا أبو داود گێڕاویەتەوەو(حسن)واتا: ئاگادار بن لەگەڵ کۆمەڵی موسڵماناندا بن، چونکە گورگ ئەو مەڕە دەخوات کە لە گاگەل دابڕاوە. وەك لە فەرموودەی یەکەمیشدا باسمان کرد بێگومان سەلەفیەکان زۆرینەو کۆمەڵی موسڵمانان نین.

* حوزەیفەی کوڕی یەمان رضي الله عنه دەفەرموێت: خەڵکی پرسیاریان لە پێغەمبەر دەکرد چی خێرە، بەڵام من پرسیارم لێدەکرد: چ شتێك خراپە بۆ ئەوەی خۆی لێبپارێزم، لێم پرسی ئەی پێغەمبەری خوداﷺ

ئێمە لە سەردەمی نەفامیدا بووین کە سەردەمێکی خراپ بوو، بەڵام خودای گەورە ئەم چاکەی لەگەڵ کردین و دینی ئیسلامی بۆ ناردین، ئایا دوای ئەم خێر و چاکەیە خراپە دێتەوە....... قال: (**نعم دُعاةٌ علی أبوابِ جَهنّم مَن أجابهُم إليها قَذفُوهُ فِيها، قُلتُ يا رسولَ اللهِ صِفهُم لَنا قال: هُم مِن جِلدَتِنا وَيَتَكلَّمونَ بِألسِنَتِنا، قُلتُ فَما تَأمُرني إن أدرَكَنيَ ذلكَ قال: تَلزِم جَماعةَ المُسلمينَ وَإمامَهُم، قلتُ: فإن لم يَكُن لَهم جَماعةٌ ولا إمامٌ قال: فاعتزلْ تِلكَ الفِرَقَ كُلَّها وَلَو أنْ تَعُضَّ بِأصلِ شَجَرةٍ حتى يُدرِكَكَ الموتُ وَأنتَ على ذلكَ**)(پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە)

واتا: بەڵێ لە دوای ئەم چاکەیە خراپە دێتەوە، خراپەکەش ئەوەیە: بانگخوازانێك لەسەر دەرگای دۆزەخ وەستاون، هەرکەسێك وەڵامیان بداتەوە و دوایان بکەوێت ئەوە دەیخەن ناو دۆزەخەوە، منیش گووتم: پێم بناسێنە ئەوانە کێن؟ فەرمووی: ئەوانە کەسانێکن وەك ئێمە خۆیان بە موسڵمان دەزانن و بە زمانی ئێمە ـ قورئان و سوننەت ـ قسە دەکەن، گووتم: ئەگەر گەیشتمە ئەم سەردەمە چی بکەم؟ چ فەرمانێکم پێدەکەیت؟ فەرمووی: لەگەڵ کۆمەڵی موسڵمانان و پێشەوایەکەیان دابە، گووتم: ئەگەر کۆمەڵی موسڵمانان نەبوو و پێشەواشیان نەبوو چی

بکەم؟ فەرمووی: واز لە هەموو گروپ و گرۆهەکان بێنە و مەچۆ پاڵ هیچیان، ئەگەر بێت و بەم هۆیەوە هەتا دەشمریت هەر قەپ لە قەدی دارێکیش بگریت.

جا لێرەدا پێغەمبەری خوداﷺ نەیفەرموو: ئەی حوزەیفە ئەگەر گەیشتیتە ئەم سەردەمە گروپێك دروست بکەو ناوی لێبنێ سەلەفی، وە پێی نەفەرموو: کە بچێتە پاڵ سەلەفیەکانەوە، بەڵکو فەرمانی پێکرد کە لەگەڵ زۆرینەی موسڵمانان و پێشەواکەیاندا بێت، ئەگەر ئەوەش نەبوو" ئەوە واز لە هەموو گروپەکان بهێنێت.

## هەڵوەستەیەك:

خاتوو عائیشە رضی الله عنها دەفەرموێت: پێغەمبەری خوداﷺ لە نەخۆشی مردنیدا بە خاتوو فاطیمەی رضی الله عنها فەرموو: (**وَنِعمَ السَّلَفُ أَنا لَكِ**)(بوخاری گێڕاویەتەوە) واتا: من باشترین پێشینەم بۆ تۆ. جا زۆر جار سەلەفیەکان ئەم فەرموودە باس دەکەن و دەڵێن: گوایە پێغەمبەرﷺ ناوی سەلەفی هێناوە ، ئێمەش لە وەڵامدا دەڵێین: ئەم فەرموودەی پێغەمبەرﷺ هیچ ئاماژەیەکی تێدا نیە بۆ ئەوەی ئێمە بێین و گروپێك

دروست بکەین بە ناوی سەلەفیەت، وە هیچ فەرمانێکیشی تێدا نیە بۆ ئەوەی ئێمە سەلەفی بین، وە خۆ ئەگەر بشڵێن: ووشەی سەلەف لە لایەن پێغەمبەرەوەﷺ بەکار هاتووە بۆ باشترین بونەوەر کە خۆیەتی ئەوەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی گروپێك و مەزهەبێك دروست بکرێت بەناوی سەلەفیەت " ئەوە ئێمەش لە وەڵامدا دەڵێن: چۆن ووشەی سەلەف لە سەر زاری پێغەمبەرﷺ بۆ باشترین بونەوەر بەکار هاتووە ئاواش ووشەی سەلەف لە قورئانی پیرۆزدا بۆ خراپترین بونەوەر بەکار هاتووە کە فیرعەونە، خودای گەورە دەربارەی فیرعەون دەفەرموێت: ﴿فَجَعَلْنَاهُمْ سَلَفًا وَمَثَلًا لِّلْآخِرِينَ﴾(الزخرف: ٥٤) واتا: فیرعەون و شوێنکەوتوەکانیانمان کردن بە پێشینە ـ سلف ـ ی تیاچوەکان و پەند و ئامۆژگاریش بۆ ئەوانەی کە بەدوای ئەواندا دێن.

کەواتا: ئێستا بۆمان دەرکەوت کە ووشەی سەلەفی هیچ بونێکی نیە لە فەرموودەی پێغەمبەریشدا.



## جێباسی سێهەم/ لە سەردەمی سەلەفدا لەگەڵ ئەوەی داخوازیش هەبووە" بەڵام هیچ گروپ و گرۆهێك نەبووە بەناوی سەلەفی

لەسەردەمی سەلەفی صالحدا زۆر ڕوداو و پێشهات هاتونەتە پێشەوە کە پێویستی بەوە هەبوو کە موسڵمانان هەوڵ بدەن بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ پێشنەـ سەلەفی ـ خۆیان، بەڵام نەهاتوون گروپێك دروست بکەن و ناوی بنێن سەلەفیەت، بۆ نمونە: لە سەردەمی ئەو فیتنەو ئاشوبەی کە پێشەوا عثمانیﷺ تێدا شەهید بوو، وە لە کاتی دروست بوونی خەوارجەکان لەسەر دەمی پێشەوا علیﷺ دا موسڵمانان زۆر پێویستیان بەوە هەبوو کە بگەڕێنەوە بۆ پێشینەی خۆیان و چاو لە ئەوان بکەن، بەڵام کە سەیر دەکەی هیچ کامێك لە پێشەوایان عثمان و علی رضي الله عنهما نەیان گووت وەرن با بگەڕێینەوە بۆ پێشینەکانی خۆمان أبوبکر و عمر رضي الله عنهما و نەهاتن گروپێك دروست بکەن بە ناوی سەلەفیەت، وە بەهەمان شێوە لە سەردەمی دروستبونی موعتەزیلەکانیشدا پێویستی و داخوازی هەبوو بۆ دروست بوونی

گروپێك بە ناوی سەلەفیەت، بەڵام پێشینەی ئەم ئوممەتە نەیان کرد، جا کە باش بایە ئەوان دەیانکر، جا کەنەیان کردووە بەڵگەیە لەسەر خەراپی" کەواتا: هەر کەسێك لەم سەردەمەدا گروپێك دروست بکات لە ژێر ناوی پیرۆزی سەلەف ئەوە بیدعەیەکی یەکجار خەراپی کردووە.
دەگێڕنەوە و دەڵێن: شیعەو سوننەیەك لێیان بوو بە موناقەشە، چەندین دانیشتنیان بەیەکەوە کرد، لە دانیشتنی کۆتایدا سوننەکە کاتێك چۆ ژوورەوە پێڵاوەکانی لەگەڵ خۆیدا بردە ژوورەوە، شیعەکە گووتی: جا من چۆن لەگەڵ تۆ وتوێژ دەکەم تۆ ئەوەندە بێ ئەدەبیت پێڵاوەکانت لەگەڵ خۆتدا هێناوەتە ژورەوە! سوننەکەش گووتی: گلەیم لێ مەکە، چونکە لە ترسی دزین پێڵاوەکانم هێناوەتە ژورەوە، شیعەکە گووتی: جا کێ لێرە دزی دەکات؟ سوننەکە گووتی: بیستومە لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ئێوەی شیعە نەعلەکانی پێغەمبەرتان دزیوە!! لەبەر ئەوە دەترسم پێڵاوەکانی منیش بدزن!! شیعەکە گووتی: ئەمە بەڵگەیە لەسەر کەم هۆشیت، چونکە لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ شیعە هەر نەبووە، کەواتا ئێمە چۆن دزیمان کردووە کە نەبووبین؟ سوننەکەش گووتی: جا ئەگەر ئێوە لەسەردەمی پێغەمبەردا نەبوون چۆن لەسەر حەقن؟ ئەگەر لەسەر

حەق بونایە ئەوە لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ بنچینەیەکتان دەبوو!. سەلەفیەکانیش ئەگەر حەق بونایە لەگەڵ ئەوەی کە لەسەردەمی سەلەفی ئومەتدا داخوازی بونیشیان هەبووە ئەو کات دەبوون.

جا ئەگەر کەسێك بڵێت: خۆ پێشەوا علی و پێشەوا عثمان رضي الله عنهما بۆ خۆیان سەلەفن ، لەبەر ئەوە ناکرێت لە ناو سەلەفدا گروپێك دروست بکرێت بە ناوی سەلەفی، چونکە سەلەف لە ناو سەلەفدا نابێت، ئێمەش لە وەڵامدا دەڵێین: ئەی بۆ ئێوەی سەلەفی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ کە بە خاتوو فاطمەی فەرموو: (وَنِعْمَ السَّلَفُ أَنا لَكِ) واتا: من باشترین پێشینەم بۆتۆ. دەکەنە بە بەڵگەی ئەوەی کە ووشەی سەلەف لە فەرموودەدا هاتووە و سەلەفیەت دروستە!! خۆ ئەمەشیان سەلەفیەتە لە ناو سەلەفدا!! چونکە هەم پێغەمبەر ﷺ و وە هەم خاتوو فاطمـــەش سەلەفی ئەم ئومەتەن، کەواتا: ئێستا هیچ گومانێك نەما لەوەی کە لەگەڵ بوونی داخوازی و زەمینەی لەباریشدا بەڵام پێشینەی ئومەت هیچ گروپ و تاقمە و گرۆهێکیان دروست نەکردووە بە ناوی سەلەفی.

# جێباسی چوارەم/ ناو لە خۆ نان بە (سەلەفی) بە شێوەیەکی ڕەها هەڵەیە:

هەر کردەوەیەك لەسەردەمی سەلەفدا کرابێت مەرج نیە باش بێت، بەڵکو زۆر کردەوە هەیە لەسەردەمی سەلەفدا کراوە" بەڵام کارێکی خراپە، وەك جەنگی نێوان هاوەڵان، هەرچەندە ئێمە خۆمان بە شیاوی قسە کردن نازانین لەسەر کێشەی نێوانی هاوەڵە بەڕێزەکان، چونکە ئەوان زۆر لەوە گەورەتر و زاناترن کە ئێمە بتوانین قسەیان لەسەر بکەین، وە ئەوان هەموویان مجتهید بوون، وە ئەو کێشانەی توشی بوون لە إجتیهادەوە بووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناکرێت کەسێك یان گروپێك بێت شەڕی گروپێکی تری موسڵمان بکات و بڵێت: بەڵگەم ئەوەیە کە سەلەف کردوویانە، وە لەسەردەمی سەلەفدا چەندین گروپ و گرۆهی گومڕا و بەهەڵە داچوو پەیدا بوون وەك: خەواریج و قەدری و جەبری ... چەندانی تر، کە ئەوانە پێمان دەڵێن کە ناو لە خۆتان بە ڕەهایی بە ووشەی سەلەف هەڵەیە و نابێت، چونکە سەردەمی سەلەف بەڵێ باشترین سەردەم بووە، بەڵام چەندین کردەوەی خەراپ و گرۆهی گومڕاشی تێدا بوون کە ئەوانیش دێنە ناو ڕەهایی ووشەی سەلەفەوە. جا ئەگەر

سەلەفیەکان بۆ ئەوە ناویان لە خۆیان ناوە سەلەفی چونکە لەسەر ڕێڕەوی ئەوان دەڕۆن و سوننەت زیندو دەکەنەوە" ئەوا وا باشتر بوو لە جیاتی ئەم ناوە ناویان لە خۆیان نابایە(محمدیین یان ڕاشدینین وە یان صحابیین) چونکە ئەمانە ئەصلی سوننەتیان جێبەجێ کردووە، دکتۆر محمد سعید رمضان بوطی دەفەرمووێت: ئەگەر دروست بێت ئەوانە ناو لە خۆیان بنێن سەلەفی " کەواتا دەبێت بڵێین دروستە موسڵمانێکی تریش ناو لە خۆی بنێت محمدی، چونکە سوننەت لەوەوە سەرچاوەی گرتووە، وە یان گرۆهێکی تر ناو لە خۆیان بنێن ڕاشدی، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرمانی کردووە شوێن سوننەتی خەلیفە ڕاشیدەکان بکەوین: (علیکُم بِسُنَّتی و سُنةِ الخلفاءِ الراشدین) واتا: شوێن سوننەتی من و سوننەتی جێنشینە ڕێنویکارەکانی من بکەون. ئەو کاتیش یەکپارچەیی ئیسلام پەرت و بڵاو دەبێت و لەو بەرنامە ڕاستەی ئیسلام لادەدەن کە پێشینەی ئوممەت لەسەری بوون.(سەلەفیەت قۆناغێکی وەختیە، دکتۆر بوطی:٨٧)



# جێباسی پێنجەم/ ناوی سەلەفی ناوێکی دزراوە!

دوای داگیر کردنی میصر لە لایەن بەریتانیاوە لە ساڵی ١٨٨٢دا، بەشێك لە زانایانی ئاینی میصر کەوتنە هەڵەیەکی کوشندەوە، پێیان وابوو کە باشتر وایە خۆمان بگەیەنینە کاروانی شارستانیەتی ڕۆژئاوا، تەنانەت ئەگەر بەهۆیەوە لە ئیسلامیش دور بکەوینەوە، واتا: ئەوان کەوتبونە ژێر کاریگەری ڕۆژئاواوە، لەبەرامبەردا کۆمەڵێکی تری دامەزراو لەسەر باوەڕ بەسەر کردایەتی هەردوو زانای بەناو بانگ(شێخ محمد عبدە و جمال الدینی ئەفغانی) پێیان وابوو دەبێت چاکسازی بکرێت لە ناو موسڵماناندا، بەوەی بگەڕێنەوە بۆ ئەصلی شەرع و قورئان و سوننەت و زانایانی سەلەف، جا هەردوو زانای ناوبراو ئاڵای بانگەشەیان بۆ ئەم چاکسازیە هەڵگرتبوو، وە لەبەر ئەوەی هەموو بانگەشەیەکی چاکسازی پێویستە دروشمێکی تایبەت بەخۆی هەبێت، بۆ ئەوەی خەڵکی لە دەورەی کۆ ببێتەوە، ئەوانیش دروشمی(سەلەفیەت)یان بەرز کردەوە،وە هەر لەم سەردەمەشدا وە هابیەکان لە وڵاتی حیجازدا بە سەرکردایەتی محمدی کوڕی عبدالوهاب سەریان هەڵداو بەتەواوەتی لە وڵاتی نەجد و

هەندێ شوێنی نیوە دورگەی عەرەبیدا بڵاویونەوە، ئەمانەش لەلایەن ئەهلی سوننەو جەماعەوە پێیان دەگووترا: وەهابیەکان، جا ئەم وەهابیانە وایان دادەنا کە بە دژی خورافیاتدا دەچنەوە، وە لەوەدا خۆیان بە هاوبەشی سەلەفیەکانی میصر دەزانی و دەیانگووت: ئەوان بە گژ خورافیاتی ڕۆژئاوادا دەچنەوە، ئێمەش بە گژ خورافیاتی ناو موسڵمانان، لەبەر ئەمە وە لەبەر ئەوەی هیچ مرۆڤێکی هۆشمەند بە دوای دروشمی وەهابیەت ناکەوێت، چونکە وەهابیەت بیدعە و داهێنراوە، بەڵام ووشەی سەلەف ووشەیەکە خەڵکی ڕادەکێشێت، چونکە خەڵکی وا هەست دەکات کە ئەم مەزهەبە بنچینەیەکی هەیە لە سەردەمی سەلەف، لەبەر ئەوە ئەوانیش هەستان ناوی خۆیان نا بە سەلەفی. (بڕوانە کتێبی سەلەفیەت قۆناغێکی وەختیە، محمد سعید رمضان البوطی:٨٩ـ ٩٠)وە ئێستاش ئەوانەی لە کوردستان بانگەشەی سەلەفیەت دەکەن لە بنچینەدا مەدخەلین، بەڵام هەروەك وەهابیەکان دەزانن کە هیچ کەسێك بە دوای مەدخەلیەت ناکەوێت، لەبەر ئەوە ناوی پیرۆزی سەلەفیان لە خۆیان ناوەو بە هۆی ئەم ناوەشەوە کۆمەڵێك خەڵکیان لە خۆیان کۆکردوتەوە.

کەواتا: خوێنەری بەڕێز بزانە کە ناوی سەلەفیەت لە بنچینەدا لە میصرو بۆ مەبەستێکی پیرۆز سەری هەڵداوە، وە ئەوکات ناوی سەلەفیەت وەك مەزهەبێك و حیزبێك و بۆ تەکفیر کردنی موسڵمانان بە کار نەدەهات، بەڵکو جوڵانەوەو بزوتنەوەیەکی ئیسلامی بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵەی بەشێك لە موسڵمانان ناویان لە خۆیان نا سەلەفی، بەڵام گروپێکی بەناو وەهابی بۆ ڕاکێشانی موسڵمانان ئەم ناوەیان دزی و کردیان بە باڵای خۆیانداو لە ژێریەوە دەستیان کرد بە تەکفیر کردن و دژایەتی کردنی موسڵمانان.



# جێباسی شەشەم/ناو لەخۆ نان بە سەلەفی ئەستۆ پاکی کردنی دەرونە

ناو لە خۆنان بە سەلەفی ئەوە دەگەیەنێت کە تەنها ئەو کەسانە لەسەر شاڕێی ئیسلامن و شوێن قورئان و سوننەت کەوتوون کە سەلەفین، جگە لەوان لە شاڕێی ئیسلام لایانداوە و شوێن قورئان و سوننەت ناکەون، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە تەنها ئەوان شیاوی چونە بەهەشتن، جگە لەوان شیاوی دۆزەخن، ئەمەش بە ئاشکرا ئەستۆ پاکی کردنی دەرونە، وە ئەمەش کردەوەیەکە دژی قورئان و سوننەتە، خودای پەروەردگا لەسەر زاری یوسفی پێغەمبەرەوە علیه السلام دەفەرموێت: ﴿وَمَا أُبَرِّئُ نَفْسِي إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّي إِنَّ رَبِّي غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾(یوسف:٥٣.)واتا: من هەرگیز پاکانە بۆ دەرونی خۆم ناکەم، چونکە بەڕاستی دەرون زۆر فەرمانکارە بە گوناه و تاوان، مەگەر دەرونێك نەبێت کە خودای گەورە بە میهرەبانی خۆی بە نوری ئیمان ئاوی دابێت، بەڕاستی خودای گەورە زۆر لێخۆشبو و میهرەبانە. وە پێغەمبەری خودا ﷺ فێری ئەوەمان دەکات کە هیچ کات بە کردەوەکانی خۆمان نە

نازین و وانەزانین بە هۆی كردەوەكانمانەوە ئەهلی بەهەشتین و ئەستۆ پاكی خۆمان نەكەین، پێغەمبەری خوداﷺ بە هاوەڵە بەڕێزەكانی فەرموو: (لَنْ يَدْخُلَ أَحَدٌ الجَنَّةَ بِعَمَلِهِ قَالُوا: وَلاَ أَنْتَ يَارَسُولَ اللهِ ؟ قَالَ: وَلاَ أَنَا إِلاَّ أَنْ يَتَغَمَّدَنِيَ اللهُ بِرَحْمَتِهِ)(بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە) واتا: هیچ كامێك بە كردەوەی خۆی ناچێتە بەهەشتەوە!! گووتیان: تۆش ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: بەڵێ منیش بەكردەوەی خۆم ناچمە بەهەشتەوە، مەگەر خودای گەورە بە سۆز و میهرەبانی خۆی دام بپۆشێت. ئەمەش وانەیەكە بۆ ئێمە بۆ ئەوەی هیچ كاتێك ئەستۆ پاكی بۆ خۆمان نەكەین و تەنها خۆمان پێ پاك و چاك و لەسەر حەق نەبێت. بەڵام سەلەفیەكان لەم ڕۆدا حەق و بەهەشتیان لە خۆیاندا كورت كردۆتەوە، بە شێوەیەك تەنها خۆیان بە شیاوی بەهەشت دەزانن، بۆ نمونە: بابایەكی سەلەفی لە ژمارە٧٣ی گۆڤاری هۆنیادا دەڵێت: تەنها یەك گروپ لە دۆزەخ ڕزگاری دەبێت، كە ئێمەی سەلەفیین!! وە هەر لەو ژمارەدا دەڵێت: ئەهلی طـــەریقەت و تەصەوف و دەروێش ئیسلامیان چڵكن كردووە، وە دەشڵێت حیزبە ئیسلامیەكانی كوردستان دژی خودان!! جا كاتێك بە وردی سەرنجی ئەم ووتانەی ئەم بابا سەلەفیە

دەدەیت، وا پێدەچێت کە ئەم بابا سەلەفیە لە قیامەتەوە هاتبێتەوە، ئەویانی لە بەهەشت بینیبێت و ئەمیشیانی لە دۆزەخ!! لەبەر ئەوە ئەوەندە بە دڵنیایی قسە دەکات، وە ئەگەر بە وردی لێکدانەوە بۆ ئەم وتانەی بکەین دەبینین ئەم وتانە ڕاستەوخۆ لەگەڵ فەرموودەی صەحیحی پێغەمبەرﷺ تێکدەگیرێن، چونکە عبداللە ی کوڕی مەسعودرضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (**إني لأرجو أن تكونوا شطرَ أهْلِ الْجنة**)(مسلم گێڕاویەتەوە) واتا: تکام وایە لایەکی بەهەشت ئوممەتی من بێت. وە بورەیدەرضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (**أهلُ الجنةِ عِشرونَ وَمائة صَفٍ ، ثمانونَ مِنها مِن هذهِ الأمَّة ، وَأربَعونَ مِن سائِرِ الأمَمِ**)(ترمذی گێڕاویەتەوە)واتا: خەڵکی بەهەشت سەد و بیست ڕیزن، لەو سەد و بیست ڕیزە هەشتایان ئوممەتی منە، وە چلەکەی تریش لە هەموو ئوممەتەکانی تر پێك هاتووە.

جا پێغەمبەری خوداﷺ لێرەدا پێمان دەفەرمووێت کە دوو لەسەر سێی دانیشتوانی بەهەشت ئوممەتی ئەون، لە بەرامبەریشدا بابای

سەلەفی دەڵێت: تەنها ئێمەی سەلەفی دەچینە بەهەشت، وەك پێشتریش گوتمان سەلەفیەکان کەمینەیەکی زۆر کەمینەن، وە تەنها دوو سەد ساڵێکیش دەبێت پەیدا بوون، جا بەو پێیە بێت ئەم بابەتە لە سێ حاڵەت تێناپەڕێت:

یەکەم/ یان ئەوەتا دەبێت بڵێین: کە پێغەمبەرﷺ ڕاست دەفەرموویت کە زۆرینەی ئەهلی بەهەشت ئوممەتی ئەون، ئەو کاتیش بۆمان دەردەکەوێت کە قسەکانی ئەم بابا سەلەفیە دژی فەرمودەی پێغەمبەرن، بێگومان هەر فەرمودەی پێغەمبەریش ڕاستە. زۆرینەی ئەهلی بەهەشت ئوممەتی پێغەمبەرن، ڕاستی ئەو فەرمودەش بەوە دێتە جێ کە هەرکەسێك بڕوای تەواوی هەبێت و کردەوەکانی ئیسلام جێبەجێ بکات ئەوە ئەهلی بەهەشتە، جا چ سەلەفی بێت وە یان هەر موسڵمانێکی تر، ئەگەرنا" ئەگەر بڵێین تەنها سەلەفی دەچنە بەهەشت، ئەو کات لە چاو بڕواداراانی ئوممەتانی پێشودا زۆر کەم دەبین و سێیەکی بەهەشتیش نابین، نەوەکو دوو لەسەرسێ. لە توێژینەوەیەکی بەریتانیدا کە سایتی (نها)دا بڵاوکراوەتەوە و کراوە بە کوردی دەرکەوتووە کە بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتی سەد

ملیار کەس مردوون!! جا ئەگەر لەم سەد ملیارە تەنها سیٚ یەکیان بڕوادار بوبن" ئەوە سەلەفیەکان لە کوێی ئەوانن؟!!

دووەم/ وە یان دەبێت بڵێین قسەکەی ئەم بابا سەلەفیە ڕاستن، ئەو کاتیش مرۆڤ کافر دەبێت، چونکە هیچ گوتەیەك لە دوای قورئان لە فەرمودەی پێغەمبەرﷺ ڕاستتر نیە.

سێیەم/ وە یان دەبێت بڵێن قسەی هەردووکیان ڕاستن، هەم هی پێغەمبەرﷺ وە هەم هی ئەم بابا سەلەفیەش، ئەو کاتیش دەبێت بڵێین: کە دانیشتوانی بەهەشت لە چەند سەد هەزار کەسێك تێناپەڕێت!! چونکە سەلەفیەکان کەمینەیەکی زۆر کەمینەن، ئەو کەمینەش دوو لەسەر سێی بەهەشت بن" ئەی دەبێت ئەوانی تر چەند بن؟!، ئەمەشیان لە عەقڵ و لۆژێکەوە دوورە و مرۆڤی هۆشمەند بڕوای پێناکات،

جا بێگومان هەر فەرموودەی پێغەمبەرﷺ ڕاستەو دروستە، موسڵمان چ سەلەفی بێت وە چ هەر موسڵمانێکی تر بێت ئەگەر کار و کردەوەکانی بە گوێرەی شەریعەتی ئیسلام بوو، ئەوە ئەهلی بەهەشتە و بەهەشت تەنها لەسەر سەلەفیەکان تاپۆ نەکراوە.

# جێباسی حەوتەم/ ئایا سەلەفیەكان مەزهەبیان هەیە یان بێ مەزهەبن؟!

سەرەتا: بۆ ئەوەی بزانین سەلەفیەكان مەزهەبیان هەیە یان نا، ئەوە دەبێت پێناسەی مەزهەب بكەین پاشان بەراوردی بكەین لە گەڵ سەلەفیەكان،

مەزهەب بریتیە لە: كۆمەڵە بیر و بۆ چون و دیدێكی زانستی و فەلسەفی تەواوكاری یەك ، كە وەك پێكهاتەیەكی یەك بەش داڕێژراون. (فەرهەنگی دەریا:٢/١٢٢٨)

وە لە بجیرمیدا دەفەرمووێت: المذهب لغة: مكان الذهاب و هو الطريق. واتا: ئەو ڕێگایەی كە لێوەی دەڕۆیت.

وە لە إصطلاحدا: الأحكام التى اشتملت عليها المسائل . شوبهت بمكان الذهاب بجامع أن الطريق يوصل الى المعاش و تلك الأحكام توصل إلى المعاد (بجیرمی ١/٤٥)واتا: بریتیە لە چەند ئەحكامێك كە چەند بابەتێكی شەرعی یان عەقیدەییان لەسەر بنیات دەنرێت، وە ئەمەشیان بە شوێنی لێوە ڕۆیشتن (ڕێگا) دەچێت، چونكە هەردووكیان لەوەدا

هاوبەشن کە لێوەیان دەڕوێ، ڕێگا لێوەی دەڕوێ بۆ بەدەست هێنانی بژێوی ژیان، وە ئەم ئەحکامانەش لێوەیان دەڕوێ بۆ بە دەست هێنانی خۆشیەکانی قیامەت

وە لە (المنجد)دا دەفەرموێت: المذهبُ:(المعتقد، الطريقة ، الأصل) واتا: مەزهەب بریتیە لە یەك بیرو باوەڕ ، ڕێگا، بنچینە.

جا من لێرەدا دەپرسم: ئایا سەلەفیەکان یەك دید و بۆچون نین و تەواکاری یەکتر نین؟ وە ئایا چەند ئەحکامێکی تایبەت بە خۆیان نیەو لەسەر ڕێڕەوی فتوای چەند زانایەکی وەك: (ابن تیمیە و ابن قیم و ابن عثیمین، ابن باز و البانی و رەبیع مەدخەلی ..) ناڕۆن؟ بێگومان بەڵێ.

جا وەك لە پێناسەکانیشدا بۆمان دەرکەوت خۆ مەزهەب هەر ئەوەیە، خۆ کەس نەهاتووە بڵێت: پێشەوا شافعی و حەنەفی مالکی و احمد پێغەمبەرن!! نعوذ بالله. بەڵکو دەڵێین: چەند زانایەکی مجتهدن و ئێمەش لەسەر فتواکانی ئەوان و شیکردنەوەکانی ئەوان بۆ قورئان و سوننەت کارو باری دینەکەمان بەڕێ دەکەین، ئەمەش جێبەجێ کردنی فەرمانی خودایە کە دەفەرموێت: ﴿فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا

﴿تَعْلَمُونَ﴾ (النحل:٤٣) واتا: لە هەر بابەتێکداشارەزا نەبوون و نەتان دەزانی ئەوە پرسیار لە خەڵکی خاوەن زانست و تایبەتمەند بکەن.

جا هەروەك چۆن ئێمە شوێن فتواو شیکردنەوەکانی ئەم چوار مەزهەبە بەگشتی و شافعی بە تایبەتی دەکەوین، بەهەمان شێوە سەلەفیەکانیش شوێن فتواو شیکردنەوەکانی (ابن تیمیە و..... ابن باز.....) دەکەون، کەواتا ئەوانیش وەکو ئێمە لەسەر مەزهەب دەڕۆن، بەڵام دوو جیاوازیان هەیە:

یەکەم/ ئەم چوار مەزهەبەی ئێمە کۆدەنگی زانایانی ئیسلامیان لەسەرە کە دروستە موسڵمان دوایان بکەوێت، بەڵکو هەردوو زانای بەناویانگ (ابن صلاح و السبکی) دەفەرموون: لادان لەو چوار مەزهەبە وەك لادانە لە کۆدەنگی زانایان ـ إجماع ـ(ڕۆناکی رب العالمین: ١٦/١) بەڵام هەرچی مەزهەبی سەلەفیەکانە" زۆرینەی زانایان یان شێوە إجماعی لەسەرە کە دروست نیە موسڵمان شوێنیان بکەوێت وەکو مەزهەبێکی سەر بەخۆ ، چونکە چەندین جار جگە لەوانیش هەوڵیان داوە کە وەکو ئەم چوار مەزهەبە مەزهەبێکی تر دروست بکەن و خۆیان بە مەزهەبی

پێنجەمی ئەهلی سوننەو جەماعە ئەژمار بکەن، بەڵام لەلایەن زانایانی ئەهلی سوننەو جەماعەوە ڕەدیان دراوەتەوەو ڕێگایان پێنەدراوە. (بڕوانە: کتێبی اللامذهبیة أخطر بدعة تهدد شریعه الإسلامیه، دکتور البوطی)

دووەم/ وە جیاوازیەکی تریشمان ئەوەیە: ئەم چوار مەزهەبە لەسەردەمی سەلەفی صالحەوە سەرچاوەیان گرتووە، شاهیدی پێغەمبەریان بۆ دراوە کە (خیر القرون)ن ، چونکە هەر چوار پێشەوای سەر مەزهەب لە سەردەمی سەلەفدا ژیاون، بەڵام مەزهەبی سەلەفیەکان لەسەردەمی خەلەف و دوو سەد ساڵێکە پەیدابووەو بیدعەیە.



# جێباسی هەشتەم/ ئایا سەلەفیەکانی کوردستان حیزبن یان نا؟

لە زۆرێك لە وولاّتان حیزبی سەلەفی هەیە و بەشداری کایەی سیاسی دەکەن و هیچ لاریەکیان لە حیزبایەتی نیە وەك: حیزبی نور و وحیزبی نیشتمانی سەلەفی لەمیصر و حیزبی إتحادی سەلەفی لە یەمەن و..هتد، لە بەرامبەریشدا گرۆهێکی تر لە سەلەفیەکان حیزبایەتی بە حەرام دەزانن، بەلاّم کاتێك دێیت و پێناسەی حیزبایەتی بەراورد دەکەیت لەگەلّ کار و کردەوە و جمجوڵیان پێکاو پێك ئەوانیش حیزبن، جا ئەوەی مەبەستی ئێمەیە لێرەدا ئەوەیە: ئایا سەلەفیەکانی کوردستان حیزبن یان نا؟ جا بۆ ئەوەی وەلاّمی ئەم پرسیارە وەر بگرین پێویستە سەرەتا بزانین پێناسەی حیزب چیە؟ دیارە زۆر پێناسە بۆ حیزب کراوە بەلاّم ئێمە دوو پێناسە هەلّدەبژێرین:

١ـ دۆڤرجە( خاوەنی کتێبی الأحزاب السیاسیة) دەلّێت: حیزب بریتیە لە کۆمەلّە خەلّکێکی یەکگرتوو لەسەر بنچینەی سیستەمێك.

٢ـ فەرهەنگی (oxford)دەڵێت: حیزب ڕێکخراوێکی سیاسیە، هاوبەشن لە بڕواو ئامانج و دەنگدان لە هەڵبژاردن.

جا دوای ئەوەی پێناسەی حیزبمان زانی با بێین برگەکانی پێناسەکان بەسەر سەلەفیەکانی کوردستاندا جێبەجێبکەین:

- گووتمان دۆڤرجە دەڵێت حیزب بریتیە لە کۆمەڵە خەڵکێکی یەکگرتوو، هیچ گومانێك نیە کە یەکگرتوو ترین گروپ وکۆمەڵە لە کوردستان سەلەفیەکانن، ئەمەش هەموو خاوەن هۆشێك هەستی پێدەکات، بە شێوەیەك (ولاء و براء) یان لەسەر سەلەفیەت و نا سەلەفیەتە، ئەوەك باوەڕ و کوفر کەواتا: بڕگەی یەکەمیان بەسەردا جێبەجێ بوو.
- لە ژێر بنچینەی سیستەمێك: ئەوەش شتێکی ئاشکرایە کە ئەوان دروشمی گەڕانەوە بۆ سوننەتیان هەڵگرتووەوکاریش دەکەن لەسەر زەق کردنەوەی بابەت خیلافیەکان وە شوێنکەوتوەکانیشیان هەر ئەمە دووبارە دەکەنەوە، کەواتا سیستەمێکی یەکگرتوشیان هەیە.

- هاوبەشن لە بڕواو ئامانج: ئەم بڕگەیەی پێناسەی دووەمیش بە ئاشکرا بوونی هەیە، چونکە هەموو سەلەفیەکانی کوردستان یەك عەقیدە و بڕوا و یەك ئامانجیان هەیە، ئەویش بریتیە لە هاندانی خەڵکی بۆ بێ مەزهەبی و لەگەڵ عەقیدەیەکی تەکفیری[1] و تەبدعی، وە ئامانجیان ئەوەیە وەك بنەماڵەی ئال شێخ ی سعودیە دەسەڵاتی فتوا بگرنە دەست و دەسەڵاتی سیاسیش جێبهێڵن بۆ عەلمانیەکان.
- هاوبەشن لە دەنگدان لە هەڵبژاردن: ئەم بڕگەیەش بە شێوەیەکی حاشا هەڵنەگر لە ناو سەلەفیەکاندا بونی هەیە، ئەمەش لە خودی سەلەفیەکان خۆیان بیستراوە، بۆ نمونە لەم هەڵبژاردنەی ڕابردووکە لە ساڵی ٢٠١٣دا ئەنجام درا، برایەکی سەلەفی پرسیاری کرد گووتی:

---

١ـ ئەم عەقیدە تەکفیریەی سەلەفیەکان لە سەردەمی محمدی کوڕی عبدالوهابەوە سەرەتای گرتووە، کاتێك سعودی کوڕی عبدالعزیز بە هاوسۆزی محمدی کوڕی عبدالوهاب فتوای کافریەتی خەڵکی مەککەو خەلافەتی ئیسلام بە ڕابەرایەتی عوسمانیەکانیان دا و دووبارە داوایان لە خەڵکی مەککەو عوسمانیەکان کرد باوەڕ بێننەوە، جا ئەم عەقیدە تەکفیری و تەبدیعیەیان ئێستاش بەردەوامە ( بڕوانە: تەوژمی فکری سیاسی وەهابی: ١٣٥وە ١٤٤)

ماموستا دەنگدان دروستە ؟ منیش گووتم: بەڵێ، گووتی: دەنا ئێمە دەنگدان بە پەسەند نازانین بۆیە دەنگ نادەین! بەڵام پاش ماوەیەك ئەم برایە بۆ خۆی گووتی: ماموستا فلان ماموستای سەلەفی گووتویەتی: دروستە دەنگ بدرێت" لەبەر ئەوە ئێمە دەنگ دەدەین. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەوان لە هەڵبژاردنیشدا هاوبەشن، چونکە بێگومان کە بە فتوای ئەو دەنگ بدات بە حەزی ئەویش دەنگ دەدات!!

جا ڕەنگە کەسێك بپرسیت و بلێت: خۆ سەلەفیەکانی کوردستان وەکو حیزب خۆیان ناناسێنن، کەواتا چۆن پێیان دەڵێیت حیزب؟ ئێمەش لە وەڵامدا دەڵێین: مەرج نیە هەر کەسێك وەکو حیزب خۆی نەناسێنێت حیزب نەبێت، بۆ نموونە: بزوتنەوەی گۆڕان لە ساڵی ۲۰۰۷دا وەکو حیزبیش خۆی ڕانەگەیاندبوو، بەڵام بەشداری هەڵبژاردنیشی کرد و دەنگی باشیشی هێنا، بەڵام خۆ لە بنچینەدا گۆڕان هەر حیزب بوو، وە دواتر لە کۆنگرەی یەکەمیاندا لە هەولێر خۆیان ڕاگەیاند، بەهەمان شێوە با سەلەفیەکانیش خۆیان وەکو حیزب نەناسێنن، بەڵام کردەوەکانیان پێیان دەڵێن: ئێوە حیزبن، وە هیچ دوریش نیە ئەگەر

بۆیان ڕەخساو کاتێك موسڵمانان دەسەڵاتیان گرتە دەست، ئەوە بۆ تێکدانی دەوڵەتی ئیسلام و یەك ڕیزی موسڵمانان وەکو سەلەفیەکانی میصر حیزبەکەی خۆیان ڕابگەیەنن!!

جا خوێنەری بەڕێز: ئێستا ئێمە بەشێوەیەکی کردەیی پێناسەی حیزبمان بەسەر سەلەفیەکانی کوردستان دا جێبەجێ کرد، لەبەر ئەوە زۆر سادەیە کە بەسەلەفیەکانی کوردستان بگوترێت: حیزبی سەلەفی کوردستان.

جا ئەگەر سەلەفیەت حیزب بێت" ئەوە وەك خۆیان دەڵێن: بونی حیزبی ئیسلامی بیدعەیە!! جا من لێرەدا دەپرسم: بۆ دروستە بۆ سەلەفیەکان کە حیزبیان هەبێت" بەڵام بۆ حیزبە ئیسلامیەکانی تر بیدعەو حەرامە؟! کەواتا: ئەمەش جارێکی تر دەیسەلمێنێت کە بونی گروهێك و حیزبێك لە ژێر ناوی سەلەفی بیدعەیە.



# جێباسی نۆیەم/ سەلەفەیەت و عەلمانیەت

هەر لە سەرەتای هاتنی ئیسلامەوە بێباوەڕانی مەککە هەوڵیان داوە کە دینی پیرۆزی ئیسلام لە بواری حوکم و دەوڵەتداری و بەڕێوەبردندا خانەنشین بکەن، کە ئەمەش لەمڕۆدا پێیی دەگوترێت: عەلمانیەت، چونکە سەرەکیترین کاری عەلمانیەکان بریتیە لە (إقلاع الدین عن الدولة) واتا: جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت، جا بۆ ئەو مەبەستەش چەندین جار بێباوەڕانی مەککە نێردراویان دەنارده لای پێغەمبەرﷺ و داوایان لێدەکرد کە ئەو خودای خۆی بپەرستێت و واز لە خودایەکانی ئەوان بهێنێت، بەڵام پێغەمبەری خوداﷺ ڕازی نەبوو، پاشان هاتن گوتیان: ئەی محمد وەرە با ساڵێك دینی ئێمە بپەرستین و ساڵێکیش دینی تۆ، بەواتای ئەوەی ساڵێك ئاینی ئێمە لە مەیدانی حوکم و کاردا بێت و ساڵێکیش ئاینی تۆ!! بەڵام خودای گەورە ڕازی نەبوو تەنها بۆ ساتێکیش ئاینەکەی لە کار بکەوێت، وە ڕازی نیە هیچ کەس و هیچ بەرنامەیەك بکرێت بە هاوبەشی و هاوبەشی دینەکەی بۆیە وەحی بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ نارد و فەرمووی: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ *

لَا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ....... لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ﴾ ( الكافرون: ١-٦)واتا: ئەی پێغەمبەرﷺ بڵێ ئەی بێباوەڕینە،، من هەرگیز دینی ئێوە ناپەرستم و کاری پێناکەم.... جا لەبەر ئەوە دینی خۆتان بۆ خۆتان و دینی خۆشم بۆ خۆم.(تفسیرالقرآن العظیم، ابن کثیر:٣٣٧/٨) جا ئەگەر هاتباو پێغەمبەری خوداﷺ ڕازیبایە ساڵێك دینی کافرەکان لە مەیدانی کار و پەرستندا بوایە، وە ئەگەر ڕازیبایە کە تەنها بۆخۆی خودای خۆی پەرستبایە و وازی لە خودا پوچەکانی بێباوەڕان هێنابایە ئەوە دەیانکردە دەوڵەمەندترین کەسی مەککەو دەیانکردە کەسێکی خاوەن ڕاوێژ و لە هەموو کارێکدا ڕاوێژیان پێدەکرد، وە توشی ئەم هەموو نەهامەتی و دەردە سەری و دورە وولاتیەش نەدەبوو، بەڵام پێغەمبەری خوداﷺ ڕازی نەبوو بەوەی بۆخۆی لە کونجێکی ماڵەکەیدا دروشمەکانی دینەکەی جێبەجێ بکات و وازیش لەوە بێنێت گەلەکەی لەسەر بەرنامەیەکی جگە لە بەرنامەی خودا بڕۆن، بەڵام سەلەفیەکان لە سەردەستی محمدی کوڕی عبدالوهاب کەوتنە ئەم هەڵە گەورە مێژووییەوە و عەلمانیەتیان هێنایە ناو ئیسلام و دەسەڵاتی دینی و دەسەڵاتی بەڕێوەبردن و سیاسیان لێك جیاکردەوە، جا عەلمانیەت بە واتای جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت

بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٧٣٧ز لەسەر دەستی محمدی کوڕی عبدالوهابی پێشەوای وەهابیەکان ـ سەلەفیەکان ـ هاتە ناودەوڵەتە ئیسلامیەکانەوە، ئەمەش دوای ئەوەی بەسەر پەرشتی بەریتانیا محمدی کوڕی عبدالوهاب لەگەڵ حمدی کوڕی ئال سعود ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی کە دەسەڵاتی دینی بکەوێتە ژێر دەستی محمدی کوڕی عبدالوهاب و بنەکاڵەکەی ـ بنەماڵەی آل شیخ ـ وە دەسەڵاتی سیاسی و بەڕێوەبردنی وڵاتیش بکەوێتە ژێر دەستی سعود و بنەماڵەکەی ـ بنەماڵەی آل سعود ـ جێگای ئاماژەیە لەو کاتەوە هەتا ئێستاش هەرچی دەسەڵاتی سیاسی و ئابوری و پەیوەندی نێو دەوڵەتی و ....جومگەکانی تری دەسەڵاتە لە ژێر دەستی بنەماڵەی ئال سعود دایە، وە هەرچی فتوای سعودیەشە لەژێر دەستی بنەماڵەی ئال شێخ دایە، جا ئەم دابەش کردنەی دەسەڵات و دینە بۆ خۆی یەکەم هەنگاوی هاتنی عەلمانیەت و جیاکردنەوەی دین بوو لە دەوڵەت لە ناو موسڵمانناندا.(بڕوانە: ڕۆڵی عەلمانیەت لە مەینەتی گەلی کورد، مسعود عبدالخالق: ١٢٩، ئەم بابەتەی بە بەڵگەنامەوە ڕونکردوتەوە)جا ئەم جیاکردنەوەی دینە لە دەسەڵات دیسان بیدعەیەکی تری سەلەفیەکان بوو هێنایانە ناو وڵاتانی ئیسلامەوە. ئەم بیدعەیەشیان هەتا ئەمڕۆش هەر

بەردەوامە و بە قەناعەتەوە بڕوایان بە دروستی عەلمانیەت هەیە، بۆ نمونە: محمد إبراهیم شەقرەی شێخی سەلەفیەکانی ئەردەن، زۆر بەقەناعەتەوە ئەم گووتەیەی عەلمانیەکانی ئەورووپا قبوڵ دەکات کە دەڵێن: (دَعْ مَا لِقَيصَرَ لِقَيصَرَ، وَ ما لِلهِ لِلهِ) واتا: ئەوەی هی قەیسەرە بیدە بە قەیسەر، ئەوەی هی خوداشە بیدە بە خودا!! محمد شەقرەی سەلەفی دەربارەی ئەم ووتەیەیان دەڵێت: (وَ أَحْسَبُ أَنَّ مقولةَ دَعْ ما لِقَيصَرَ لِقَيصَرَ، وَ ما لِلهِ لِلهِ ، كِلمةً تصلُحُ لِزَمانِنا!!)(هی السلفية:١٧٢ وە بلێ و کەفی یەك درو گومانی سەلەفی:٢١)واتا: من وا دەزانم ئەو گووتەیەی کە دەڵێت: ئەوەی هی قەیسەرە بیدە بە قەیسەر، ئەوەی هی خوداشە بیدە بە خودا، بۆ ئەمڕۆ گونجاو و شیاوە، ئەمە لە کاتێکدا خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾(الأعراف:٥٤) وە دەفەرمووێت: ﴿قُلْ إِنَّ الْأَمْرَ كُلَّهُ لِلَّهِ﴾(آل عمران: ١٥٤) واتا: هەرچی کارو باری ئەم بونەوەرەیە لە دەستی خودا دایە و هی خودایە. وە خودای گەورە بە هیچ شێوەیەك ڕازی نیە مولکی دابەش بکات لەگەڵ قەیصەرەکاندا!.

جا بۆ ئەوەی تۆی خوێنەر بزانیت داخوا چی هی قەیسەرە و چی هی خودایە ڕێکەوتننامەی مۆسۆلینیت بۆ باس دەکەم: مۆسۆلینی ئیتالیا لە ساڵی ١٩٢٩ لەگەڵ کەنیسە و پاپا ڕێك کەوت کە: منداڵ لە سکی دایکیدا هەتا لە دایك دەبێت بۆ خوداو کەنیسە بێت، کە لە دایك بو هەتا دەمرێت، بۆ دەوڵەت بێت، پاشان کە مرد دەیدەنەوە بە کەنیسە و خودا!!(ڕۆڵی عەلمانیەت لە مەینەتی گەلی کورد:٤٦) جا ئەمەش وەك ڕێکەوتنی شەیتان و شەریکەکەی وابو کە شەیتان بە شەریکی خانوەکەی گووت: وەرە با خانوەکە بەش بکەین، گووتی: چۆن؟ شەیتان گووتی: لە زەویەوە بۆ سەریان کە یەك دوو مەترێکە بۆ من، لە سەریانیشەوە هەتا ئاسمان کە هەزاران کیلۆ مەترە هەمووی بۆ تۆ!! جا ئەوکات وەك ئێستاش نەبوو خانو و بینای چەندین قات بکرێت، جا لە سەریانەوە هەتا ئاسمان هەرچەندێك بێت چ سودێك هەیە؟!! بە هەمان شێوە مرۆڤیش لە سکی دایکیدا هەتا لە دایك دەبێت، وە دوای مردنیش چ سودێکی هەیە؟! ئەم فێڵەی عەلمانیەکانیش وەدەرنانی ئاین بو لە هەموو ژیان، کەچی شێخی سەلەفیەکانی ئەردەن زۆر بە قەناعەتەوە ڕازیە بە ڕێکەوتننامەی مۆسۆلینی، وە ڕازیە بەوەی دەسەلاتی سیاسی و ئابوری و ئەخلاقی و

پەروەردەیی و.... بە دەستی عەلمانیەکانەوە بێت، چونکە تاپۆی قەیسەرە، ئەوەی بۆ دین و خوداش دەمێنێتەوە ئەوەیە موسڵمان بە بلیتی تایبەت و لە مزگەوتێکی دیاری کراو نوێژێکی بە پەلە هەڵپڕوکێنێت و بڕوات و ئاوڕ نەداتەوە!!



# جێباسی دەیەم/ سەلەفی بوون بە کردەوەیە نەوەک دروشم!!

خودای گەورە زۆر ڕقی لە قسەی بێ کردەوەیە، لەبەر ئەوە دەفەرمووێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ اللَّهِ أَن تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ﴾(الصف: ٢-٣) واتا: ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە بۆ شتێك دەڵێن و ئەنجامی نادەن، بۆ کردارتان دژی گوفتارتانە؟ خەشم و ڕقی لای خودا گەورەیە ئەوەی کە دەیڵێن و نایکەن. .وە ئەگەر تەنها بە دروشم بێت ئەوە دەبێت بڵێین کە خەواریجەکان لە هەموو کەس لەسەر حەق تر بوون" چونکە ئەوان بانگەشەی (ان الحکم إلا لله) یان دەکرد، کەواتا: لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە ئیسلامدا دروشم هیچ بەهایەکی نیە، بەڵکو ئەوەی بەهای هەیە بریتی لە کردار، جا هەر کەسێك بانگەشە بۆ سەلەفیەت بکات لەسەری پێویستە بەکردەوە بیسەلمێنێت کە شوێنکەوتەی سەلەفە جا ئێمە لێرەدا تەنها چەند نمونەیەك باس دەکەین کە تێیان دا سەلەفیەکانی ئەم ڕۆژگارە لە ڕێڕەوی سەلەفی صالح لایانداوە:

١ـ سەلەفیەکان لە پێناسەی باوەڕدا پێچەوانەی سەلەفی صالحن:
ئەگەر بێت و لە گەنجێکی ساویلکەی هەڵخەڵەتاوی سەلەفی بپرسیت: تۆ بۆ شوێن ئەم سەلەفیانە کەوتوویت؟ لە وەڵامدا پێت دەڵێت: بۆ ئەوەی عەقیدە و بیر و باوەڕم وەکو سەلەفی صالح بێت. بەڵام ئەم بەستەزمانە نازانێت کە بەناو زانا سەلەفیەکان فێڵیان لێکردووە، ئەگەرنا ئەم سەلەفیانە لە زۆر بواری عەقیدەدا لە سەلەفی ئوممەت جیاوازن، ئەم سەلەفیانەی ئەمڕۆ هەتا لە پێناسەی باوەڕیشدا لەگەڵ سەلەفی صالح تێکناکەنەوە، سەلەفی صالحی ئوممەت پێناسەی باوەڕیان بەوە کردووە کە باوەڕ بریتیە لە: (گوفتار و کردار و نیەت) پێشەوا شافیعی رحمه الله دەفەرموێت: (كانَ الإجماعُ منَ الصحابةِ والتابعينَ مِن بعدِهِم و مَنْ أدرَكناهُم يَقولونَ: الإيمانُ قولٌ و عَمَلٌ و نيةٌ، لا يُجزءُ واحِدةٌ مِنَ الثلاثةِ إلا بالآخَرِ)مجموع فتاوى إبن تيميه: ٣٠٩/٧.واتا: کۆدەنگی هاوەڵان و شوێنکەوتوان و جگە لەوانیش هەموو ئەو کەسانەی پێیان گەیشتووین لە پێشینەی ئوممەت دەیانفەرموو: بڕوا بریتیە لە گوفتار و کردار و نیەت، وە هیچ کامێکیان بەبێ ئەوی تریان بە کەڵك نایەت.

بەڵام سەلەفیەکانی ئەمڕۆ دەڵێن: بڕوا بریتیە لە گوفتار و نیەت، وە کردار مەرج نیە بۆ باوەڕ بەڵکو تەواو کەریەتی، بەواتای ئەگەر کەسێك بە دڵ باوەڕی هەبێت و بە زمان ئیقرار بکات ئەگەر هەتا دەمرێت یەك چاکەش نەکات، وە نوێژیش پشتەو قیبلە و بە بێ دەستنوێژی بکات، وە زیناش لەگەڵ مەحرەمی خۆی بکات، وە زەنناری مەسیحیانیشی ببەستێت،......هتد ئەوە هەر موسڵمانە!! (بلق و کفنی یەك دوو گومانی سەلەفی:٥٤-٥٣)ئەمەش لە ئەصلدا بیر و باوەڕی (مرجیئە)کانە، جا سەلەفیەکانی ئەمڕۆ لەبەر ئەوە ئەم پێناسەیە بۆ باوەڕ دەکەن بۆ ئەوەی شەرعیەت بدەن بە کاربەدەستە ستەمکارەکانی دوونیا، بۆ ئەوەی کەس نەتوانێت بڵێت: زین العابدین کە حیجابی قەدەغە کردبوو لە تونس، وە حسنی ناموبارەك کە سەدان و هەزاران موسڵمانی لە گرتوخانەکاندا ڕزاند، ئەوانە کافرن، وە کەس نەتوانێت بڵێت: فلان عەلمانی کە نوێژ ناکات و گاڵتە جاڕی بە ڕوکنەکانی باوەڕ و ئیسلام دەکات بە کەڵکی وەلی ئەمر نایەت، ئەگەر وات گووت: یەکسەر بابای مەدخەلی بەناو سەلەفی پێت دەڵێت: کاکە خۆ کردار مەرج نیە بۆ باوەڕ، ئەوانە بە زمان شایەتومان دێنن" جا با ڕێگری لە بڵاوبونەوەی ئیسلامیش بگرن،

با نەشهێڵن ئافرەت حیجابی بکات، با بلیتی نوێژکردنیش دروست بکەن، با پێچەوانەی شەرعی خوداش کار بکەن....!! ئەوانە هەر موسڵمانن!! ئەوانە لە هەموو موسڵمانێکی ڕاستەقینەی پەیوەست بە قورئان و سوننەوە شیاوترن بۆ وەلی ئەمر!! ئەمەش سەد لە سەد پێچەوانەی عەقیدەی سەلەفە، بەڵام بەداخەوە چەندان گەنج ئەم ڕاستیە نازانێت و بۆ یان دەخەڵەتێت.

جا ڕەنگە سەلەفیەکان بۆ خەڵەتاندنی گەنجان نکۆڵی لەم پێناسەی خۆیان بکەن بۆ باوەڕ، بەڵام بەری خۆر بە بێژینگ ناگیرێت، ئەم پێناسەیەیان لە کتێبەکانیاندا جێگیرە. بۆ نمونە: ئەلبانی دەڵێت: (عملُ الجوارحِ شرطُ كمالِ للإيمان) واتا: کرداری ئەندامەکان مەرجی تەواوی باوەڕە" نەوەك شەرتی باوەڕ!! وە محمد ابراهیم شەقرە دەڵێت: ئەگەر کەسێك شایەتمانی هێنا و لە دڵیشدا بە ڕاستی زانی و قەناعەتی پێی بوو، باوەڕیشی بە هەموو داواکاریەکانی باوەڕ هەبوو، ئەوە موسڵمانە!! ئەی کردار؟ هەر بەلایدا نەچووە. وە عەلی حەلەبی بەهەمان شێوەی ئەلبانی و شەقرە دەڵێت: کردار مەرج نیە بۆ باوەڕ، بەڵکو دەڵێت هەر کەسێك بڵێت: کردار مەرجە بۆ باوەڕ خەواریج و موعتەزیلەیە!! (بلق و

کەڤی یەك دوو گومانی سەلەفی: ٤٥ـ ٥١) سبحان الله ئەم حەلەبیە هەستیشی بەخۆ نەکردووە کە بە سەلەفی صالحی ئوممەت دەڵێت: خەواریج و موعتەزیلە، چونکە وەك باسمان کرد کۆدەنگی سەلەف لەسەر ئەوە بووە کە کردار مەرجە بۆ باوەڕ.

٢ـ پشت کردنە ڕاو فتوای زانایانی سەلەف و ڕو کردنە زانایانی پاشینە ـ خلف ـ: زانایانی سەلەف بریتین لە هاوەڵە بەڕێزەکان و زانایانی تابعین و تابیعی تابیعین، وە لە ناو زانایانی تابیعین و تابعی تابعینیش ئەو زانایانەی کە بە شێوەیەکی متمانە پێکراوە زانستەکەیان بە ئێمە گەیشتووە و لە ناو موسڵمانانـدا بڵاو بووەتەوە بریتین لە هەر چوار زانای سەر مەزهەبی بەڕێز: ( أبوحنیفە و مالك و شافعی و احمد)، چونکە پێغەمبەری خوداﷺ شاهیدی حەق بێژی و ڕاستگۆیی و باشی ئەم چەرخانەو زاناکانی داوە، عیمرانی کوڕی حصینرضي الله عنهلە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (خَيرُكُم قَرني ثُمّ الذينَ يَلُونَهُم ثُمَّ الذينَ يَلونَهُم ، قال عمرانُ : لا أَدرِي أَذَكرَ النَبيُّ ﷺ بعدُ قرنينِ أو ثلاثةً ، قال النَبيُّﷺ: إنَّ بعدَكُم قوماً يخونون ولا يُؤتَمنونَ ،

وَيَشهَدونَ ولا يُستَشهدون ، ويَنذِرونَ ولا يُفونَ)(بوخاری گێڕاویەتەوە)واتا: باشترینی ئومەتەکەم سەدەی سەردەمی منە، پاشان ئەوانەی بە دوای ئەواندا دێن وە پاشان ئەوانەی بە دوای ئەواندا دێن، جا عیمران دەفەرمووێت: نازانم پێغەمبەرﷺ نە دوو سەدەی دوای خۆی ژماردن نە سێ، پاشان پێغەمبەرﷺفەرمووی: بە دوای ئەم سەدە باشانەدا خەڵکانێك دێن کە ناپاکی دەکەن و سپاردە ناپارێزن، وە بێئەوەی داوای شاهیدیان لێبکرێت شاهیدی دەدەن، وە نەزر دەکەن و وەفای پێناکەن.

عبدالله ی کوڕی عەمری کوڕی عاصرَضِيَ اللهُ عَنْهُ لە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (إِنَّ أُمَّتَكُمْ هَذِهِ جُعِلَ عَافِيَتُهَا فِي أَوَّلِهَا، وَسَيُصِيبُ آخِرَهَا بَلَاءٌ وَأُمُورٌ تُنكِرُونَهَا)(مسلم گێڕاویەتەوە)واتا: ئەو ئومەتەی ئێوە خودای گەورە بە هێزی و ساغی خستوتە سەرەتایەکەیەوە، وە کۆتاییەکەی توشی بەڵاو چەندین کێشە دەبن کە نکوڵی لێدەکەن.

جا لێرەدا چۆن پێغەمبەرﷺشاهیدی چاکەی بۆ سێ سەدەکەی خۆیدا، ئاواش ئاگاداری کردوینەوە کە دوای ئەم سەدانە خەڵکانێکی

خراپ دێت، و کێشەو ئاشوب زیاد دەبێت، ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی
کە بە هەموو شێوەیەك زانست و زانیاری و بیرو باوەڕی زانایانی سەلەف
لە هی ئەم سەردەمەی ئێستا پارێزراو ترە، بەڵام کەسەیر کەین
سەلەفیەکانی ئەمڕۆ لە چەندین بابەتدا پێچەوانەی زانایانی سەلەف و
هاوەڵان و تابعین ئیش دەکەن، وە ئامادە نین گووتەو فتوای زانایانی
سەلەفی وەکو چوار مەزهەبەکە وەربگرن، کە پێغەمبەرﷺ شاهیدی
چاکەی بۆ داون، بەڵام لەهەر باسێکدا پرسیاریان لێبکەیت دەڵێن: ابن
عثیمین یان ألبانی یان ابن باز یان فوزان یان .... ئاوا دەڵێت، وە کاتێك
کتێبەکانیان دەخوێنیتەوە دەبینیت پڕیانە لە قسەی ئەمانە، لە کاتێکدا
هەر یەکێك لەمانەی ناومان بردن لەم سەدەیە و سەدەی ڕابردودا ژیاون
لە بەرامبەریشدا زۆر دەگمەن دەبینیت کە باسی گووتە و فتواکانی چوار
مەزهەبەکە بکەن، لە کاتێکدا ئەوان لە سەردەمی سەلەفدا ژیاون، جا
من لێرەدا دەڵێم: ئایا کەسێك بانگەشەی سەلەفیەت بکات وا باشتر نیە
ئەگەر لەبەر خاتری بانگەشەکەشی بێت زیاتر ئیش لەسەر ڕاو فتوای
زانایانی سەلەف بکات وەکو هی زانایانی پاشینە؟ بێگومانیش
ئەصحاب و هاوەڵان و زانایانی تابعین و چوار مەزهەبەکە لە سەردەمی

سەلەفدا ژیاون" نەوەکو إبن عثیمین و ألبانی و ابن باز و فوزان و ربیع مەدخەلی و.... جا ئەم زانایانەی پاشینە ئەگەر گوێشیان لێبگیرێت" دەبێت لە بابەتێکدا گوێیان بۆ بگیرێت کە هەنوکەیە و لەسەردەمی سەلەفدا نەبووە، دەنا ئەگەر بابەتێك لەسەردەمی سەلەفی صالحدا هەبووبێت و قسەیان لێکردبێت" ئەوە وا باشترە و پارێزراوترە و سەلەفیانەترە ئەگەر گوێ بۆ ئەوان بگرین نەوەکو ئەوانەی ئێستا.

٣ـ ڕازیبوون و دان نان بە حاکمی عەلمانی و بە وەلی ئەمر زانینی:
یەکێکی تر لە بیدعەو لادانی سەلەفیەکان لە بەرنامەو مەنهەجی سەلەفی صالح بریتیە لە ڕازیبوون و بە وەلی ئەمر زانینی عەلمانیەکان، هەروەك باسمانکرد هیچ گوومانێك نیە لەوەی کە کاری سەرەکی عەلمانیەکان بریتیە لە(إقلاع الدین عن الدولة)واتا: لە ڕەگ و ڕیشە دەرهێنانی دین لە هەموو بوارێکی بەڕێوە بردن و کاروباری دەوڵەتداری، وە مارکسی عەلمانی دین بە تریاك دەزانێت و دەڵێت: (الدین أفیون الشعوب) دین تریاکی گەلانە، جا هەر کەسێکیش ئەم بڕوایەی هەبێت و کار بکات بۆ دەرهێنان و جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت" بێگوومان کەسێکی لە دین دەرچووە و بەکەڵکی ئەوە نایەت ببێت بە وەلی ئەمری

موسڵمانان، پێشەوا قاضی عیاض رحمه الله دەفەرموویت: (أَجْمَعَ العُلَماءُ عَلى انَّ الإمامَةَ لا تَنعقِدُ لكافرٍ، و على أنَّهُ لَو طَرأَ عَليه الْكُفرُ إنعزلَ، وَ كَذا إذا تركَ الصلواتَ و الدعاءِ إليها، و كَذالِكَ عِند جمهُورهِم البِدعَة)(منهاج: ١١-١٢/ ٤٣٣)واتا: زانایانی ئیسلام کۆدەنگن - إجماعیان هەیە - لەسەر ئەوەی کە بە هیچ شێوەیەك کار بەدەستی و پێشەوایەتی موسڵمانان بۆ کافر دانامەزرێت، وە هەر کاتێك کاربەدەستی موسڵمانان کوفرێکی بەسەردا هات دەبێت لە کار بەدەستی بخرێت، وە بەهەمان شێوە زانایان کۆ دەنگن لەسەر ئەوەی ئەگەر کاربەدەستی موسڵمانان وازی لە نوێژ کردن هێنا وە خەڵکیشی بانگ نەکر بۆ نوێژ کردن ئەوە دەبێت لە لایەن موسڵمانانەوە لە کاربەدەستی بخرێت، وە زۆرینەی زانایانیش لەگەڵ ئەوەن کە هەر کاتێك کار بەدەستی موسڵمانان بیدعەیەکی خراپی لێوەدەر کەوت دەبێت لە کاربەدەستی بخرێت. جا لێرەدا من پرسیارێك لە سەلەفیەکان دەکەم: ئایا بە لانی کەمەوە عەلمانیەت بیدعە نیە؟ وە ئایا عەلمانیەکان نوێژ دەکەن و بانگەوازی بۆ دەکەن؟ وەڵامەکەی: بێگومان عەلمانیەت بیدعەیە و عەلمانیەکانیش نوێژ ناکەن و بانگەوازیشی بۆ ناکەن، ئەی بۆ برایانی سەلەفی بە وەلی

ئەمریان دەزانن؟!! خۆ هیچ کاتێك سەلەفی صالح بەوە ڕازی نەبوون و کەسێکیان بە وەلی ئەمر نەزانیوە کە هەوڵی دابێت بۆ قەلاچۆ کردنی دین و بە ئاشکرا بێ شەرعی کردبێت، بەڵکو بە گژیشی داچوونەوە، بۆ نمونە: کاتێك لە (بنی أمیة) سەرپێچی شەرعی بینرا، إمام حسن و ابن زبیر و خەڵکی مەدینە لە دژیان هەستان، وە کاتێك حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی لە سنورەکانی شەرع دەرچوو و بیدعەی خراپی لێدەرکەوت، کۆمەڵێکی زۆر لە تابعینەکان لێی هەڵستان و ناڕەزاییان دژی دەربڕی،(بڕوانە:منهاج شەرح صحیح المسلم: ١١ـ ١٢/ ٤٣٣) بەڵام سەلەفیەکانی ئێستا لە هەموو دوونیادا کاربەدەستە عەلمانیەکان بە وەلی ئەمر دەزانن، هەر بۆ نمونە: سەلەفیەکانی کوردستان لێرەوە دژی شۆڕشی گەلی میصر بوون، چونکە محمد حسنی ناموبارەکی عەلمانیان بە وەلی ئەمر دەزانی و دەیانگووت: ڕاپەڕین و شۆڕش لە دژی حەرامە!! ئەمەش لە بنچینەدا بیر و بڕوای مەدخەلیەکانە!!(بڕوانە سایتی ویکبیدیا، تیار المدخلی) جا ئەگەر ئەوان بە ڕاستی شوێن کەوتەی سەلەفن بۆ وەکو سەلەفی صالح بە گژ کاربەدەستە بیدعەچیەکاندا ناچنەوە،ئەگەر دەشڵێن توانامان نیە، خۆ توانای ئەوەیان هەیە کە شەرعیەتیان پێنەدەن و بە وەلی ئەمری

شەرعی خۆیانیان نەزانن، کەواتا لێرەشدا بە ئاشکرا بۆمان دەردەکەوێت کە سەلەفیەکانی ئەمڕۆ تەنها بە دروشم لەگەڵ سەلەفی صالحن ئەگەر نا" زۆرێك لە کردەوەکانیان لەگەڵ سەلەفی صالح ئاسمان و ڕێسمانیان فەرقە.

٤ـ جیهاد و تێکۆشان لە پێناوی خودادا: خودای پەروەردگار لە چەندین ئایەتدا فەرمانی بە موسڵمانان کردووە کە لە پێناوی ئاینە پیرۆزەکەیدا تێبکۆشن و بجەنگن،خودای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿انفِرُوا خِفَافًا وَثِقَالًا وَجَاهِدُوا بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾(التوبة: ٤١) واتا: ئەی باوەڕداران هەر کاتێك لە لایەن سەرکردەیەکی متمانە پێکراوەوە بانگهێشت کران بۆ غەزا" ئەوە ئێوە بە چەکی قورس و سوك و بە سواری و بە پیادە ڕاپەڕن و ئامادە بن و لە پێناوی خودادا بە ماڵ و گیانتان بجەنگن، ئا ئەوە بۆ ئێوە چاکتر و باشترە ئەگەر بزانن و تێبگەن. وە خودای گەورە مژدەی پاداشتێکی گەورەی داوە بەو کەسانەی کە لە پێناوی خودادا دەجەنگن و دەفەرمووێت: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ آوَوا وَّنَصَرُوا أُولَٰئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَّهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ﴾

(الأنفال: ٧٤) واتا: ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو لە پێناوی خودادا کۆچیان کردووە و جەنگاون ، وە ئەو کەسانەش کە پێشوازیان لە کۆچکاران کرد و حاواندیاننەوە" ئائەوانە باوەڕداری ڕاستەقینەن، وە خودای گەورەش لێخۆشبونی خۆیانی پێدەدات ، وە بۆیان ئامادە کراوە ڕزق و ڕۆزیەکی بە پیێز و بەرەکەت و جوان و ڕازاوە.

جا چینی سەلەفی صالحی ئەم ئوممەتە زۆر جوان وەلآمی ئەم ئایەتەی خودایان داوەتەوە و زۆر مەردانە لە خزمەتی پێغەمبەرﷺ دا لە پێناوی خودادا جەنگاون، وە زۆر جار هاوەڵی وا هەبووە وەك ابوبکری صدیق رضي الله عنه بە خۆیی و هەموو ماڵیەوە چووە بۆ غەزا، وە هەر بەهەوڵ و تێکۆشان و غەزای سەلەفی صالح بوو کە هەردووك ئیمپڕاتۆڕیەتە گەورەکەی جیهان (ڕۆمانی و ساسانی) بە چۆکدا هاتن، وە هاوەڵە بەڕێزەکان و زانایانی سەلەف هەموو کاتێك عەشقی جیهاد و تێکۆشان بوون، بۆنمونە: خالدی کوڕی وەلید رضي الله عنه دەفەرموویت: (ما من ليلة يُهدَى إليّ فيها عروساً أنا لها مُحِبّ، أو أُبشَّر فيها بغلام، أحب إليَّ مِنْ لَيلةِ شديدةِ البَردِ، كثيرة الْجِليدِ في سريةٍ أُصبِّحُ فيها العَدو)

(الجهاد لإبن مبارك: ٩١/١) واتا: هیچ شەوێك کە تیایدا بوکێکم بۆ بێنن کە من خۆشم دەوێت، وە هیچ شەوێك کە تیایدا موژدەی بونی کوڕێکم پێدەدەن" لام خۆشتر نیە لە شەوێکی ساردی بەستەڵەك کە من تیایدا لەگەڵ سریەیەك دەرچووبم بۆ غەزا. وە پرسیاریان کرد لە پێشەوا احمدی کوڕی حەنبەل دەربارەی غەزا، ئەویش دەستی کرد بە گریان و فەرمووی: (ما مِن أعمالِ البرِّ أفضَل مِنْهُ)(المغنی: ٩٩/٩) واتا: هیچ کردەوەیەکی چاك باشتر نیە لە جیهاد.

جا ئەمەی ڕابرا ئایەتی خودا و ووتەی سەلەفی صالح بوو دەربارەی گەورەیی جیهاد و تێکۆشان، وە گووێمان چینی سەلەفی صالحی ئوومەت لە خزمەتی پێغەمبەرﷺ و دوای ئەویش زۆر مەردانە بۆ سەرخستنی ئەم دینە جەنگاون و جیهادیان کردووە، بەڵام ئەوەی جێگای هەڵوەستە لەسەر کردنە ئەوەیە: سەلەفیەکانی ئەم سەردەمە لەم بابەتەشدا لە ڕێڕەوی سەلەفی صالح لایانداوە و زۆر بەلای جیهاددا ناچن، بەڵکو لەم سەردەمەدا لە هیچ شوێنێك بە هیچ شێوەیەك ڕێگا بە جیهاد نادەن، بە بیانوی ئەوەی گوایە ئێستا مەرجەکانی واجب بوونی جیهاد لەبەر دەست نین. بڕوانە سایتی ویکیبیدیا. ئەمەش بێ ئەوەی بزانن کە جیهاد تەنها بە تفەنگ

و دەست نیە، بەڵکو جیهاد جاری وا هەیە بە دەستە، جاری واهەیە بە زمانە، پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (جاهِدوا المُشركينَ بِأموالِكم و أيدِيكُم و ألسنتكُم)(نسائی گێڕاویەتەوە)واتا: بجەنگن لەگەڵ هاوبەش دانەراندا بە ماڵ و دەست و زمانتان. وە ابی سعیدی خودری رضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (انَّ مِنْ أَعظَمِ الجِهادِ كَلِمَةُ عَدلٍ عِندَ سُلطانٍ جائِرٍ)(ترمذی بە سەنەدێکی حسن گێڕاویەتەوە) واتا: گەورەترین جیهاد بریتیە لە گوتنی قسەیەکی حەق لای کاربەدەستێکی ستەمکار.

وە هەر ابو سەعیدی خودری رضي الله عنه دەفەرمووێت: گوێم لە پێغەمبەری خوداﷺ بوو دەیفەرموو: (مَنْ رَأى مِنكُم مُنكَراً فَليُغَيرهُ بِيَدِهِ ، فَإنْ لَمْ يَستَطِع فَبِلسانِهِ ، فإنْ لَمْ يَستَطِعْ فَبِقَلبِهِ ، وَذلكَ أَضعَفُ الإيمانِ)(مسلم گێڕاویەتەوە) واتا: هەر کەسێك لە ئێوە کارێکی نابەجێ و بێ شەرعی بینی با هەوڵ بدات بە دەست بیگۆڕێت،ئەگەر نەیتواتی با بە زمان بیگۆڕێت، وە ئەگەر بە زمانیش نەیتوانی با بەدڵ پێی ناخۆش بێت.

بەڵام ئەوەی بە ئاشکرا دەیبینین سەلەفیەکانی ئەم ڕۆژگارە لە هیچ شوێنێکی ئەم دوونیایە هەوڵی گۆڕانکاری نادەن بە دەست، وە بە زمانیشی نایڵێن، چونکە یەکێك لە بنەماکانی مەدخەلی ئەوەیە کە ئامۆژگاری کار بەدەست بە حەرام و دەرچون لە فەرمانبەرداری وەلی ئەمر دەزانن. (بڕوانە سایتی ویکیبدیا، تیار مدخلی). وەك پێشتریش گوتمان ئەوانەی ئێستاش مەدخەلین و ناوی پیرۆزی سەلەفیان بەبەر خۆیاندا کردووە. وە تەنها خوداش دەیزانێ ئایا بە دڵ کاری بێشەرعی و نابەجێیان پێناخۆشە یان نا!!

ئینجا لێت تێك نەچێت سەلەفیەکان کتێب دەنوسن لەسەر گەورەیی جیهاد، ووتاریشی لەسەر دەخوێننەوە، بەڵام بۆ ئەوەیە چاوی موسڵمانانی پێبەستن، ئەگەرنا لە مەیدانی کاردا هەرگیز بەلایدا ناچن!!

٥ـ تەڵاقی سێ بەسێ: لە سەردەمی جێنشینایەتی پێشەوا عمری کوڕی خەتتابدا ﵁ بە کۆدەنگی هاوەڵان بڕیار درا کە هەر کەسێك سێ بەسێ تەڵاق بخوات و بە پێچەوانەکەشی کار بکات، ئەوە هەرسێك تەڵاقی دەکەون، بەڵام سەلەفیەکانی ئەمڕۆ دەڵێن: هەرکەسێك سێ بەسێ تەڵاق بخوات ئەوە هەر یەکێ دەکەویت، ئەمەش وەك شوێن

كەوتنی فتوای ابن تیمیە، جا من لێرەدا لە هەر كەسێكی خاوەن هۆش دەپرسم: ئایا پێشەوا عمرێك و هاوەڵانێك رضی الله عنهم كە پێغەمبەری خوداﷺ شاهیدی دادپەروەری و چاكی بۆ داون و سەلەفی ئوممەتن باشترە شوێنیان بكەوین یان ابن تەیمیە كە لە سەدەی حەوتەمدا ژیاوە؟ ئایا امامی عمر رضي الله عنه سەلەفترە یان ابن تیمیە؟

٦ـ دوو بانگی جومعە: لە سەردەمی پێشەوا عثمانیكوڕی عەففاندا رضي الله عنه كاتێك مەدینە فراوان بوو بە كۆدەنگی ئەصحابەكان بانگەكانی جومعە كران بە دوو بانگ، بەڵام ئێستا هەر مزگەوتێك مەلایەكەی سەلەفی بێت تەنها یەك بانگی تێدا دەگووترێت!! جامن دەپرسم: ئایە برایانی سەلەفی بۆ خۆتان نالێن: پێغەمبەری خوداﷺفەرموویەتی: (**فَعَلَيكُم بِسُنَّتِي، وَسُنَةِ الخُلفاءِ الرَّاشِدِينَ المَهدِيين عَضُّوا عَلَيها بِالنَّواجِذِ**)(حاكم گێڕاویەتەوە) واتا: دەست بگرن بە سوننەتی من و سوننەتی جێنشینە ڕێنمونی كارەكانم و بە خرێنەی ددانەكانتان توند بیگرن، جا ئایا پێشەوا عثمانی كوڕی عەففان رضي الله عنه یەكێك نەبوو

لە جێنشینەکانی پێغەمبەرﷺ و لە سەلەفی صالح نیە؟ ئەی بۆ شوێنی ناکەون و جومعان دوو بانگ نالێن؟!!

٧ـ خوێندنی تەسبیحاتی دوای نوێژە فەرزەکان بە دەنگ: ابن عەبباس رضي الله عنه دەفەرمووێت: (إنَّ رَفعَ الصَّوتِ بالذكرِ حِينَ يَتَصرفُ الناس مِن المكتوباتِ كان عَلى عَهدِ رَسولِ اللهِ)(مسلم گێڕاویەتەوە)واتا: بێگومان دەنگ بەرز کردنەوە بە زیکری دوای نوێژە فەرزەکان" لە سەردەمی پێغەمبەری خوداﷺ هەبوو. جا ئەم فەرموودەی ابن عەبباس بێ پێچ و پەنا و صەحیحە کە پێغەمبەرﷺ و سەلەفی صالح تەسبیحاتیان بە دەنگ کردووە، وە پێشەوا نووی دەفەرمووێت: (هذا دليلٌ لِما قالَهُ بعضُ السلَف أنّهُ يستحبُ رفعُ الصوتِ بالتكبيرِ والذكرِ عَقَبَ المكتوبة)(منهاج: ٥/ ٨٦) واتا: ئەم فەرموودە بەڵگەیە بۆ گووتەی ئەو زانایانەی سەلەف کە دەفەرموون: دەنگ بەرز کردنەوە بە الله أكبر و زیکرەکانی تر دوای نوێژە فەرزەکان سوننەتە. کەچی سەلەفیەکانی ئەم سەردەمە ئەم کارەی سەلەفی صالح بە بیدعە و گومڕایی دەزانن، جا

ئەگەر بەڕاستی شوێن کەوتەی سەلەفی صالحن بۆ وەکو ئەوان تەسبحات بە دەنگ ناکەن؟!!

٨ـ خود پەسەندی و تەنها حەق دان بە خۆ: ئەگەر سەیری زانایانی سەلەف بکەین ئەوە دەبینین کە هیچ کاتێك تەنها خۆیان پێ لەسەر حەق نەبووە و حەقی ڕەهایان بە خۆیان نەداوە، بەڵکوو سەلەف وەکو پێشەوا شافعی فەرموویانە: (قَولي صَحيحٌ يَحتَمِلُ الخَطَأَ وَقولَ غَيري خَطأ يَحتَمِلُ الصَّوابَ) واتا: قسە و ڕای من ڕاستە" بەڵام ئەگەری هەڵەشی هەیە، وە قسە و ڕای بەرامبەریشم هەڵەیە" بەڵام ئەگەری ڕاستیشی هەیە. بەڵام سەلەفیەکانی ئەمڕۆ دەڵێن: قسە و ڕای من ڕاستە و هیچ مەجالێکی هەڵەی تێدا نیە، وە قسە و ڕای بەرامبەریشم هەڵەیە و هیچ ئەگەری ڕاستیشی نیە، ئەمەش بە ئاشکرا لەوە دەردەکەوێت کە هەرکاتێك بۆ خۆیان دەربارەی بابەتێك ڕایەکیان هەبوو" ئەوە بێ سێ و دوو ڕای بەرامبەرەکەیان بە بیدعە ئەژمار دەکەن.وە لەوەش خراپتر لە زیاتر لە ملیارێك و سێ سەد ملیۆن موسڵمان تەنها خۆیان بە شیاوی بەهەشت دەزانن کە ڕێژەیان لە چەند ملیۆنێك تێناپەڕێت، ئینجا وە ك باسمان کرد مەلایەکی سەلەفی لە گۆڤاری هۆنیادا دەڵێت: ئومەتی

ئیسلام بوّتە حەفتاو سیّ فیرقە، هەموویان دەچنە دۆزەخ، تەنها ئێمەی سەلەفی نەبێت!! ئەمەش رێك و پێك دەمان گێڕێتەوە بوّ سەردەمی کەنیسە لە ئەوروپا، کاتێك پیاوانی کەنیسە بەهەشتیان بە خەڵکی دەفرۆشت!! وە دوبارە ئەم بیر و بۆچونەشیان پێچەوانە فەرمودەی صحیح و سەلەفی صالحە، وەك گووتمان پێغەمبەرﷺ فەرمووبەتی: منیش بە کردەوەی خۆم ناچمە بەهەشت، پێشەوا عمری کوڕی خەتتابرضي الله عنه لە سەرەمەرگدا فەرمووی: سەرم بخەنە سەر زەوی بەڵکو خودای گەورە بە زەلیلی بم بینێت و بەزەیی پێمدا بێتەوە!! کەچی کاکی سەلەفی زۆر لە پێغەمبەرﷺ و پێشەوا عمر رضي الله عنه لە خۆی دڵنیاترە کە دەچێتە بەهەشت!!

جا خوێنەری بەرێز ئەوانەی ڕابران مشتێك بوون لەو خەرمانەی کە سەلەفیەکانی ئەمڕۆ تێیاندا لە ڕێڕەوی سەلەفی صالح لایانداوە، وە چەندین و چەندین نمونەی تریش لەبەر دەستدایە، بەڵام لە ترسی درێژبونەوە نەمان نوسین، ئەمانەش هەموویان ئەوە دەردەخەن کە سەلەفیەت لەمڕۆدا تەنها دروشمە و کرداری لەگەڵدا نیە، بە هیچ شێوەیەکیش خودای گەورە تەنها دروشم وەرناگرێت.

# جێباسی یازدەهەم/ مەرج نیە هەرچی بەڵگە بێنێتەوە لەسەر حەق بێت، بەڵکو ئەو کەسە لەسەر حەقە کە بەڵگەکەی لەجێی خۆیەتی!!

قورئانی پیرۆز و فەرمودەکانی پێغەمبەرﷺ بە زمانی عەرەبی هاتوون، زمانی عەرەبیش زمانێکی دەوڵەمەندە و ووشەکانی فرەمانا و هاومانان ، لەبەر ئەوە دەتوانرێت یەك ئایەت یان یەك فەرموودە زیاتر لە واتایەك و حوکمێکی لێوەر بگیرێت، وە جگە لەمەش بە حوکمی ئەوەی ئێمە کوردین و قورئان و فەرموودەش بە زمانی عەرەبین" زۆرێك لە موسڵمانانی کورد بە تایبەت گەنجەکان واتای ئایەتەکانی قورئان و فەرموودە نازانن، لەبەر ئەوە ئەگەر کەسێك لە خودا نەترسێت دەتوانێت ئایەتیك یان فەرموودەیەك بکاتە بەڵگە بۆ ئەم نەخوێندەوار و عارەبی نەزانانە کە ئەصلەن پەیوەندی بەم بابەتەوە نەبێت و قەناعەتیشی پێبکات، لەبەر ئەوە مەرج نیە هەر کەسێك بەڵگەی هێنایەوە لەسەر حەق بێت، بەڵکو ئەو کەسە لەسەر حەقە کە بەڵگەکەی لە جێگـــــای

خۆیەتی، بۆ نمونە: خەواریجەکان[1] بە بەڵگەی قورئان پێشەوا علی کوڕی ابی طالیبیان ﵁ بە کافر دادەنا و خاتو عائیشەی دایکی ئیماندارانیشیان حەڵاڵ کرد بوو بۆ ئەوەی ببێتە کەنیزەك و خوێنی برا موسڵمانەکانی سوپای موعاویەشیان حەڵاڵ کردبو، بەڵام ابن عباس چۆ ناویان و بە بەڵگەوە جوابی بەڵگەکانیانی دایەوەو گومانەکانی لابردن، بە هۆی ئەمەشەوە زورێك لە خەواریجەکان خودا هیدایەتی دان و گەڕانەوە بۆ ناو ڕیزی موسڵمانە ڕاستەکان ئەمەی خوارەوەش بەڵگەکانیان و جوابی ابن عباس ﵁ بوو:

دوای شەهید کردنی پێشەوا عثمان ﵁ پێشەوا علی ﵁ لیژنەیەکی پێك هێنا بۆ ئەوەی تاوانبارە ڕاستەقینەکان بدۆزێنەوە، وە پێشەوا علی نامەیەکیشی بۆ موعاویە ﵁ نوسی لە نامەکەدا ناوی خۆی بە (أمیرالمؤمنین) نە نوسیبو، بەڵکو بە علی کوڕی أبوطالیب نوسیبوی، ئەمەش بۆ ئەوەی یەك ڕیزی موسڵمانان زیاتر نەشێوێت،

---

١ـ تێبینی: ئێمە سەلەفیەکان بە خەواریج و لە دین دەرچو ئەژمار ناکەین، بەڵکو بە موسڵمانی لادەر بیدعەچیان دەزانین، وە ئەم نمونە بۆ ئەوە دەهێنینەوە بۆ ئەوەی تۆی بەڕێز بزانیت کە خەواریجەکان بەڵگەشیان پێبو، بەڵام لەسەر حەقیش نەبوون.

بەڵام خەوارجیەکان هاتن و بە بەڵگەوە پێشەوا عەلیان کافر کرد و گووتیان:

١ـ تۆ لیژنەیەکت پێکهێناوە بۆ دۆزینەوەی بکوژانی عثمان، ئێمەش بە لیژنە ڕازی نیین، بەڵکو دەبێت قورئان حاکم بێت چونکە خودا دەفەرموێت: ﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ﴾(الانعام:٥٧)واتا: حوکم تەنها بۆ خودایە، پێشەوا عەلیش رضي الله عنه فەرمووی: ئاخر خۆ قورئان قسە ناکات، بەڵکو دەبێت ئەم لیژنەیە کار بە قورئان بکات، دەیانگووت: نەخێر تۆ بە حاکمیەتی قورئان ڕازی نیت.

٢ـ دەیانگووت: ئێمە سوپای ئیسلامین، کەواتا بەرامبەرەکەمان کافرە ـ کە سوپای موعاویە بوـ کەواتا: دەبێت ئێمە کاتێك ئەوانمان تێك شکاند ماڵیان بۆ ئێمە حەڵاڵ بێت و ژنەکانیشیان بکەین بە کەنیزەك، ئەگەر موسڵمانیشن بۆ شەڕیان لەگەڵدا بکەین، ئەمە لە کاتێکدا لە ناو سوپای موعاویەدا خاتوو عائیشەی دایکی ئیماندارانیشی تێدا بوو رضی الله عنها.

٣ـ دەیانگووت: کاتێك تۆ نامەت نوسیوە بۆ موعاویە، نەتنوسیوە لە ئەمیری باوەڕدارانەوە، کەواتا: دەبێت تۆ یان ئەمیری باوەڕداران بیت، یان ئەمیری کافران،

بەڵێ بەم سێ بەڵگەیە: پێشەوا عەلیان رضی الله عنه بە کافر دانا، وە خوێن و ماڵی موسڵمانانی سوپای موعاویەشیان بە حەڵاڵ زانی، وە فتوای ئەوەشیان دا کە دروستە خاتوو عائیشە ببێتە کەنیزەك!! نعوذ بالله

بەڵام دواتر ابن عەبباس رضی الله عنهما چۆ ناویان و یەك بەیەك وەڵامی بەڵگەکانی دانەوە و هەموو گومانەکانیشی بۆ موسڵمانان ڕەواندنەوەو فەرمووی: یەکەم/ ئێوە دەڵێن حوکم تەنها بۆ خودایە﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ﴾الانعام: ٥٧. گووتیان: بەڵێ، فەرمووی: دە خودای گەورە بۆ هەشت یەکی چارەکە درهەمێك حوکمی داوە بە ئادەمیزادەکان و دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَقْتُلُوا الصَّيْدَ وَأَنْتُمْ حُرُمٌ وَمَنْ قَتَلَهُ مِنكُمْ مُتَعَمِّدًا فَجَزَاءٌ مِثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ النَّعَمِ يَحْكُمُ بِهِ ذَوَا عَدْلٍ مِنكُمْ﴾ (المائدە: ٩٥) واتا: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە لە کاتێکدا ئێوە لە ئیحرامدان نێچیر ڕاو مەکەن، جا هەر کەسێك لە ئیحرامدا بە ئارەزو

نێچیری ڕاو کرد دەبێت قوربانیەکی وەکو ئەو نێچیرە پێشکەش بکات، وە دەبێت ئەم حوکمەش دوو کەسی شارەزای دادپەروەر لە خۆتان بیدەن.

فەرمووی: جا سوێندتان دەدەم بە خودای گەورە، ئایا حوکم کردنی پیاوان لە کەروێشك و هاوشێوەکانی لە نێچیرەکان باشترە یان حوکم کردنیان لە خوێنی موسڵمانان و ڕێکخستنەوەیان؟! خۆ ئێوە دەزانن ئەگەر خودای حەزی کردبایە بۆخۆی حوکمەکەی یەکلا دەکردەوەو نەیدەدایە دەست پیاوان. گووتیان: بەڵکو حوکم کردن لە خوێنی پیاوان و ڕێکخستنەوەی موسڵمانان باشترە،

ئینجا فەرمووی: وە خودای گەورە بۆ خۆی بڕیاریداوە کە کاتێك ماڵێك کێشەی تێکەوت" ئەوە یەکێك لە خزمانی ژنەکە و یەکێکیش لە خزمانی پیاوەکە ببنە حاکم و کێشەکەیان چارەسەر بکەن، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَا إِن يُرِيدَا إِصْلَاحًا يُوَفِّقِ اللَّهُ بَيْنَهُمَا﴾النساء: ٣٥.واتا: ئەگەر ترسان لەوەی ئەگەر نێوانی ژن و مێردەکە بشێوێت و کێشەکەیان چارەسەر نەبێت، ئەوە دادوەرێك لە خزمانی پیاوەکە و دادوەرێك لە

خزمانی ژنەکە بنێرن، جا ئەگەر ئەم دوو دادوەرە چاکسازی و ڕێکخستنیان بووێت، ئەوە خودا پێکیان دەهێنێتەوە. جا ابن عباس رضي الله عنهما فەرمووی: سوێندتان دەدەم بە خودا ئایا حوکم کردنی پیاوان لە خوێنی یەکتر و ڕێکخستنەوەیان باشترە یان حوکم کردن لە داوێنی ژنان و ژن ومێردا؟! گووتیان: بەڵکو لە خوێنی موسڵمانان و ڕێکخستنەوەیان.

فەرمووی: ئایا لەوەدا وەڵامتان وەرگرت گووتیان: بەڵێ.

پاشان فەرمووی: بە نیسبەت ئەوەی کە دەڵێن: ئێمە کەشەڕیان لەگەڵدا بکەین دەبێت ماڵ وسامانیان بە تاڵان بگرین و ژنەکانیشیان بکەین بە کەنیزەك، ئایا ئێوە نەتان زانیوە کە لە ناو سوپای بەرامبەردا خاتوو عائیشەی تێدایە کە دایکی باوەڕدارانە، جا ئایا ئێوە ئامادەن دایکتان عائیشە رضی الله عنها بە کەنیزەك بۆ خۆتان حەڵاڵ بکەن؟ جا ئەگەر ئێوە وەکو ئافرەتانی تر ئەو بۆ خۆتان بە حەڵاڵ بزانن ئەوە کافر دەبن، وە ئەگەر بشڵێن دایکمان نیە ئەوە دیسان کافر دەبن، چونکە خودای گەورە بە دایکتانی ناو بردووە: ﴿النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ

أَنفُسِهِمْ وَأَزْوَاجُهُ أُمَّهَاتُهُمْ﴾الأحزاب:٦.واتا: پێغەمبەرﷺ نزیکترە بە باوەڕداران لە خودی خۆیان، وەخێزانەکانیشی دایکیانن.جا ئێوە لە نێوان دوو گومڕایدا هەڵدەسوڕێن، ئایا هیچ ڕێگایەکتان هەیە بۆ ئەوەی لێوەی دەرباز بن. ابن عەبباس رضي الله عنه دەفەرمووێت: پێم گووتن ئایا لەوەشدا وەڵامتان وەرگرت، گووتیان: بەڵێ.

ئینجا فەرمووی: بە نسبەت بەڵگە سێهەمیشتانەوە، کەپێشەوا عەلی ناوی خۆی بە أمیر المؤمنین نەنوسیوە، ئەوە ئێستا وەڵامی ئەویشتان دەدەمەوە بە شێوەیەك پێی ڕازی بن، ئایا ئێوە نەتان بیستووە کاتێك لە صلحی حودەیبیە پێغەمبەری خواﷺ بە پێشەوا علی رضي الله عنه فەرموو: بنوسە ئەم صولحە کرا لە نێوان محمد پێغەمبەری خواﷺ ، کاتێك سوهەیل نێردراوی کافرەکان گوێی لێبوو گووتی: (والله لو نعلم أنك رسول الله ما صددناك عن البيت ، ولكن اكتب محمد بن عبد الله) واتا: سوێندبە خودا ئەگەر ئێمە تۆمان بە پێغەمبەری خودا زانیبایەی ئەوە ڕێگریمان لێنەدەکردی لەوەی بێیتە ناو بەیتەوە، لەبەر ئەوە بنوسە محمدی کوڕی عبدالله. جا پێشەوا عەلی نکوڵی کرد لەوەی (رسول الله) ڕەش بکاتەوە، بەڵام پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (امْحُ يَا عَلِيُّ رَسُولَ اللَّهِ،

اللّهُمّ إنّكَ تَعْلَمُ أَنِّي رَسُولُكَ، امْحُ يَا عَلِيُّ، وَاكْتُبْ هَذَا مَا صَالَحَ عَلَيْهِ مُحَمّدُ بْنُ عَبْدِ اللّهِ) واتا: ڕەشی بکەوە ئەی عەلی، خودایە بێگوومان تۆ دەزانی کە من پێغەمبەرم با ئەوان نکوڵیشی لێبکەن، لەبەر ئەوە ڕەشی بکەوە و بنوسە محمدی کوڕی عبدالله.

دە سوێند بە خودا پێغەمبەرﷺ لە عەلی باشتر بوو، ئەو ناوی خۆی سڕیەوە و بە سڕینەوەی ناوەکەشی لە پێغەمبەرایەتی نەخرا، ئێوە چۆن تەنها بەوەی پێشەوا علیرضي الله عنه ناوی خۆی سڕیوەتەوە ئێوە بە ئەمیری موسڵمانانی نازانن؟! ئایا لەمەشیاندا قەناعەتتان کرد و وەڵامتان وەرگرتەوە؟ گووتیان بەڵێ ، جا بەهۆی ئەم ڕونکردنەوەیەوە خودای گەورە هیدایەتی دوو هەزار نەفەری داو گەڕانەوە ڕیزی موسڵمانان، ئەوانی تریش لە شەڕدا کوژران و بە هیلاك چوون. النسائي گێڕاویەتەوە. خصائص أمير المؤمنين علي بن أبي طالب : ٢٠٠

جا خوێنەری بەڕێز خەواریجەکان بۆ بە کافردانانی پێشەوا علیرضي الله عنه و حەڵاڵ کردنی ماڵ و خوێنی موسڵمانان بە حەڵاڵ زانینی خاتوو عائیشە رضي الله عنها بۆ کەنیزەکی بەڵگەشیان دێنایەوە، بەڵام بەڵگەکانیان لە جێگای خۆی نەبوو، لەم ڕۆژگارەشدا برا سەلەفیەکان زور جار بەڵگە

دێننەوە بەڵام بەڵگەکانیان لە جێگای خۆیدا نیە، ئێمە لێرەدا چەند نمونەیەك باس دەکەین:

١ـ بەڵگە دێننەوە بۆ قەدەغەیی خوێندنی زیکری دوای نوێژەکان بە دەنگی بەرز بە ئایەتی: ﴿وَاذْكُر رَّبَّكَ فِي نَفْسِكَ تَضَرُّعًا وَخِيفَةً وَدُونَ الْجَهْرِ مِنَ الْقَوْلِ بِالْغُدُوِّ وَالْآصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ الْغَافِلِينَ﴾(الأعراف: ٢٠٥) دەڵێن ئەو ئایەتە بەڵگەیە کە نابێت دوای نوێژە فەرزەکان تەسبیحات بە دەنگ بکرێت چونکە خودای گەورە دەفەرمووێت: لەبەر خۆتەوە و بە بێ دەنگی زیکرەکان بخوێنە!! بەڵام کاتێك لە ئایەتەکە ورد دەبیتەوە بۆت دەردەکەوێت کە بەبەڵگە هێنانەوەی ئەم ئایەتە هەڵخەڵەتاندنی موسڵمانانە، چونکە ئەم ئایەتە باسی زیکری دوای نوێژە فەرزەکان ناکات" بەڵکو باسی زیکرەکانی بەیانیان و ئێواران دەکات: ﴿بِالْغُدُوِّ وَالْآصَالِ﴾ هەتا ئەوە قسەی ابن عثیمنیشە. (بڕوانە مجموع فتاوى و رسائل ابن عثيمين: ١٣/ ٢٤٨٣٤٩)

٢ـ بەڵگە دێننەوە بۆ حەرامی مەولود بە فەرموودەی پێغەمبەرﷺ کە فەرموویەتی: (لا تُطْرُونِي كَمَا أَطْرَتِ النَّصَارَى ابْنَ مَرْيَمَ ، فَإِنَّمَا

**ألَا عَبْدٌ ، فَقُولُوا: عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ**)(بوخاری گێڕاویەتەوە) واتا: بەرزم مەكەنەوە بە شێوەیەك كە گاورەكان عیسای كوڕی مەریەمیان بەرز كردەوە. جا سەلەفیەكان دەڵێن: ئەو فەرموودە بەڵگەیە بۆ ئەوەی كە مەولود كردن و باقی یادەكانی تری تایبەت بە پێغەمبەرﷺ قەدەغەیە، چونكە ئەوە خۆ شوبهاندنە بە گاوران و بەرز كردنەوەی پێغەمبەرەﷺ بۆ سەروی ئاستی خۆی، بەڵام كاتێك لە فەرموودەكە ورد دەبیتەوە دەبینیت دیسان ئەم فەرموودە بۆ ئەوە نابێت بیكەی بەبەڵگە بۆ ئەم بابەتە، چونكە پێغەمبەرﷺ لە كۆتایی فەرموودەكەدا دەفەرمووێت: (**فَإِنَّمَا أَنَا عَبْدٌ ، فَقُولُوا: عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ**) واتا: من بەندەیەكم ، ئێوەش پێم بڵێن بەندە و نێردراوی خودا، جا لێرەدا پێغەمبەرﷺ نافەرمووێت: مەولودێ مەكەن یان لە هیچ بۆنەیەكدا یادم مەكەنەوە، بەڵكوو دەفەرمووێت: هەروەك چۆن گاورەكان دەیانگووت: عیسا خودایە و كوڕی خودایە" ئێوە مەم گەیەننە ئەو ئاستە، جا گەیاندنە ئەو ئاستەی پێغەمبەرﷺ چ لە مەولوددا بێت وە چ لە هەر كاتێكی تردا بێت هەر حەرامە و پەیوەست نیە تەنها بە مەولود و یادەكانی ترەوە.

٣ـ بەڵگە دێننەوە بۆ نەچونی فاتحە بۆ مردوو بە ئایەتی: ﴿وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَىٰ﴾النجم: ٣٩ دەڵێن: خودا فەرموویەتی: مرۆڤ چاکەی هیچ کەسێکی بۆ ناچێت تەنها هی خۆی نەبێت، کەواتا فاتحەشی بۆ مردو ناچێت، بەڵام کاتێك لەم ئایەتە ورد دەبیتەوە بۆت دەردەکەوێت کە ئەم ئایەتە باسی ئەوە ناکات داخوا کردەوەی خەڵکی تر و فاتحە بۆ مردو دەچێت یان نا، بەڵکو دەفەرمووێت: مرۆڤ تەنها خاوەنی کردەوەکانی خۆیەتی، وە تەنها خۆشی دەتوانێت ڕەفتاری تێدا بکات، ئەمەش تەفسیرو ڕای ابن تەیمیەیە کە دەفەرمووێت: خودا نەیفەرمووە کە: (إنَّ الإنسانَ لا يُنتَفَعُ إلا بِسعى نفسهِ)واتا: مرۆڤ تەنها هەوڵ وکۆششی خۆی سودی پێدەگەیەنێت، بەڵکو فەرموویەتی: ﴿وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَىٰ﴾واتا: مرۆ تەنها خاوەنی کۆششی خۆیەتی و ناتوانێت ڕەفتار لە کۆششی خەڵکی تردا بکات، وە خەڵکانی تریش بە هەمان شێوە خاوەنی کۆششی خۆیانن و مافی ڕەفتار کردنیان تێدا هەیە، جا ئەگەر کەسێك بە حەزی خۆی بەشێك لە کۆششەکەی خۆی بکاتە دیاری بۆ مردوویەك پێی دەگات، چونکە ڕەفتاری لە کردەوەی خۆیدا کردووە و ڕەفتارەکەشی دروستە. (مجموع فتاوى لابن تيميه:٢٤/٣٦٧)

جا ئەمانە دیسان مشتێکن لە خەرمانێك، کە تیایدا سەلەفیەکانی ئەم سەردەمە بەڵگە دێننەوە لە قورئان و سوننەت، بەڵام کاتێك لێی ورد دەبیتەوە بۆت دەردەکەوێتە، کە ئەم بەڵگە هیچ پەیوەندیەکی بەم بابەتەوە نیە، بەڵام بە داخەوە گەنجی کورد ناتوانێت ئەم وردەکاریە بکات، لەبەر ئەوە کە گوێی لە بەڵگەکانیان بوو وا دەزانێت کە تەنها ئەوان ڕاستن و لەسەر حەقن ، چونکە بەڵگەیان پێیە، نازانێت کە ئەم بەڵگانە زۆرێکیان بۆ ئەم بابەتە نابن، دەگێڕنەوە: لە گوندێکدا مام سەیدێك[1] هەبوو خەڵکی بە پیاوی چاکی تێدەگەیشتن، لەبەر ئەوە ساڵانە زەکات و سەرفترەیان پێدەدا، پاش ماوەیەك مەلایەك چۆ ئەم گوندە، کاتێك وەختی زەکات و سەرفترە هات، مەلایەکە لە ووتاردا گووتی: چەند بەشێك لە خەڵکی هەن زەکاتیان پێناشێت یەکێك لەوانە سەیدەکانن، چونکە ئەوان لە بنەماڵەی پێغەمبەرن ﷺ، بنەماڵەی پێغەمبەریش زەکاتیان پێناشێت، دوای ئەوە مام حاجیەك چو بۆ لای

١- زۆر ڕێزو خۆشەویستی تایبەتم بۆ سەیدە بەڕێزەکان هەیە، چونکە زۆرینەی هەرە زۆریان کەسانی چاك و باشن، بەڵام ئەم نمونە تەنهابۆ ڕون کردنەوەیە، وە هەموو بنەماڵەیەکیش کەسی خراپی هەر تێدا دەبێت. لەبەر ئەوە بە گەورەیی خۆتان ببورن.

ماڵی مام سەید و گووتی: مام سەید بە خوا من بڕیارم دابوو ئەمساڵیش هەموو زەکات و سەرفترەکە بدەم بە جەنابت، بەڵام مامۆستا لە ووتاردا گووتی: لەبەر ئەوەی ئێوە سەیدن و لە بنەماڵەی پێغەمبەرن زەکاتتان پێناشێت، مام سەید گووتی: چۆن ئەم مەلایە وایگووتووە، دیارە ئەم مەلایە هیچ نازانێت، ئەگەرنا خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێت: (قُلْ هوَ اللهُ أَحَدٌ) ئەم ئایەتەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە زەکات بە سەییدان دەشێت، مام حاجیش فەقیرە کە نازانێت واتای(قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ) چیە، گووتی: بە قوربانت دەبم مام سەید ئێستا دڵم قەناعەتی کرد ئێستا دەچم زەکاتەکەت بۆ دێنم!! جا (قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ) لە کوێ و زەکات لە کوێ، بەڵام چونکە نەیدەزانی بڕوای پێکرد.

جا بەڕاستی وەك گووتمان لەم ڕۆژگارەشدا زۆر جار برا سەلەفیەکان بەڵگە دێننەوە بۆ حەرامی و نادروستی کردەوەیەك کە هیچ پەیوەندیەکی بەم بابەتەوە نیە، ئەمەشیان دیسان بیدعەیە، چونکە هیچ کاتێك سەلەفی صالح بەم شێوەیە و بە بەڵگە نادروست خەڵکیان نە خەڵەتاندووە.



# جێباسی دوازدەهەم/چەند فەرموودەیەك كە باسی صیفاتی سەلەفیەكانی ئەم سەردەمە دەكات:

پێغەمبەری خوداﷺ لە چەند فەرموودەیەكدا باسی نیشانەی چەند كەسانێك دەكات كە لە ناو ئوممەتەكەی پەیدا دەبن، كاتێك ئەم فەرموودانە بەراورد دەكەی لەگەڵ بیرو بۆ چون هەڵسو كەوتی سەلەفیەكانی ئەمرۆ هەمان ئەو نیشانانەیان تێدایە كە پێغەمبەری خودا ﷺ ئاماژەی پێكردوون، لەو فەرموودانە:

١ـ پێشەوا علی كوڕی ابی طالب رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەفەرمووێت: گوێم لە پێغەمبەری خودا ﷺ بوو دەیفەرموو: (**سَيَخرُجُ قَومٌ فِي آخرِ الزَّمانِ أحداثُ الأسنانِ سُفَهاءُ الأحلامِ، يَقُولُونَ مِن خَيرِ قَولِ البَرِيةِ لا يُجاوِزُ إيمانُهُم حَناجِرَهُم، يَمرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَما يَمرُقُ السَّهمُ مِنَ الرَّمِيةِ**)(بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە)واتا: لە كۆتایی زەمان دا خەڵكانێك دێنە دەرەوە، كە تازە پێدەگەن، وە خەون خەیاڵی گێلانەیان هەیە، كاتێك قسە دەكەن ئەوە بە باشترین قسەكانی بونەوەر قسەدەكەن كە

فەرموودەکانی پێغەمبەرن ﷺ، جا ئەوانە باوەڕ لە گەردنیان ناچێتە خوار، وە لە ڕاستە ڕێی دین لا دەدەن و دەردەچن هەروەکو چۆن تیر لە کەوانەکەی دەردەچێت.

٢ـ وە هەر پێشەوا علی کوڕی ابی طالب رضي الله عنه دەفەرموویت: گوێم لە پێغەمبەری خودا ﷺ بوو دەیفەرموو: (**يخرج قومٌ مِنْ أُمَّتي يقرءون القُرآنَ لَيس قِراءتُكُم إلى قِراءَتِهم بشيءٍ وَلا صَلاتُكم إلى صَلاتِهم بشيءٍ وَلا صِيامُكُم إلى صِيامِهِم بشيءٍ، يقرءونَ القُرآنَ يَحسَبُونَ أنَّهُ لَهُم وَهُوَ عَلَيهِمْ لا تُجاوِزُ صلاتهم تراقِيَهُم. يَمْرُقُونَ مِنَ الإسلامِ كَما يَمرُقُ السَّهمُ مِنَ الرَّمِيةِ**)(مسلم گێڕاویەتەوە) واتا: لە ئوممەتەکەم خەڵکانێك دەردەچن قورئان دەخوێنن" بە شێوەیەك قورئان خوێندنی ئێوە لە چاو هی ئەوان هیچ نیە، نوێژ دەکەن" بە شێوەیەك نوێژی ئێوە لە چاو هی ئەوان هیچ نیە، بە ڕۆژو دەبن" بە شێوەیەك ڕۆژوی ئێوە لە چاو هی ئەوان هیچ نیە، وە قورئان دەخوێنن و بە بەڵگەی دێننەوە وادەزانن لە سودی ئەوانە نازانن کە قورئان لە دژیانە، جا نوێژەکانیان لە قورگیان

ناچێتە خوار، وە ئەوانە لە شارێی ئیسلام دەردەچن هەروەکو چۆن تیر لە کەوان دەردەچێت

٣ـ سەهلی کوڕی حنیف ﵁ لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (**يَتِيهُ قَوْمٌ مِنْ قِبَلِ الْمَشرِقِ مُحَلَّقَةٍ رُؤُوسُهُمْ**)(مسلم گێڕاویەتەوە)واتا: لە لای ڕۆژهەڵاتی مەدینەوە کۆمەڵێک لە ڕێگای ڕاست لادەدەن و گومڕا دەبن، نیشانەیان ئەوەیە کە سەری دەتاشن!

٤ـ ابن عمر ﵄ لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (**يَنْشَأُ نَشْأٌ يَقْرَؤُونَ الْقُرآنَ لاَيُجاوِزُ تَراقِيَهُمْ ،كُلَّما خَرَجَ قَرنٌ قُطِعَ، قال ابن عمر﵄: سَمِعتُ رَسولَ اللهِ ﷺ يَقُول: كُلَّما خَرَجَ قَرنٌ قُطِعَ ، أكثرَ مِنْ عِشرِينَ مَرةً، حتى يَخرُجَ فِي عِراضِهِمُ الدَّجّالُ**)(ابن ماجه گێڕاویەتەوە)واتا: خەڵکانێک پەیدا دەبن، قورئان دەخوێنن لە گەردنیان تێناپەڕێت، جا هەر چینێکیان دەردەچێت دەبڕێندرێتەوە، ابن عمر﵄دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ زیاتر لە

بیست جار ئەوەی فەرموو، پاشان فەرمووی: لە مەیدانی ئەواند دەجال دەردەچێت.

٥ـ پێغەمبەری خوداﷺدەستکەوتی جەنگی دابەش دەکرد، پیاوێك کە پێیان دەگووت: ذو الخويصرة گووتی: (**يا رسول الله اعدِل**)واتا: **ئەی پێغەمبەری خودا دادپەروەربە لە دابەش کردنیدا، پێغەمبەرﷺ** فەرمووی:(**وَيلَكَ فَمَنْ يَعدِلُ إِذا لَم أعدِلْ قَد خِبتَ وَخَسِرْتَ إنْ لم أكنْ أعدِل**) واتا: تیا بچیت، ئەگەر من دادپەروەر نەبم کێ داد پەروەرە؟ بە ڕاستی خەسارەت مەند و مایە پوچی ئەگەر من دادپەروەر نەبم، پێشەوا عمرﷺ هەستاو فەرمووی: ڕێگام بدە ئەی پێغەمبەری خوداﷺ با لە ملی بدەم و بیکوژم،پێغەمبەرﷺڕێگای نەداو فەرمووی: (**إنَّ مِن ضِئضِئِ هذا – أو في عَقِبِ هذا – قَوماً يَقرَءونَ القرآنَ لا يُجاوِزُ حَناجِرَهُم يَمرُقُونَ مِنَ الدِّينِ مُرُوقَ السَّهمِ مِنَ الرَّمِيَّةِ يَقتُلُونَ أهلَ الإِسلامِ وَيَدَعُونَ أهلَ الأوثانِ " لَئِنْ أدرَكتُهُم لَأَقتُلَنَّهُم قَتلَ عادٍ**) (بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە) واتا: لە پشتی ئەمە خەڵکانێك پەیدا دەبن، قورئان دەخوێنن بەڵام لە گەردنیان ناچێتە خوار، لە ڕاستە ڕێی دین دەردەچن هەروەکو چۆن تیر لە کەوان دەردەچێت، وە شەڕی موسڵمانان

دەکەن و واز لە بت پەرستان و کافران دێنن، جا ئەگەر من بگەمە سەردەمی ئەوان"ئەوە شەڕیان لەگەڵ دەکەم و دەیانکوژم وەکو کوشتنی گەلی عاد.

جا ئەگەر سەیری ئەم فەرموودانە بکەین دەبینین پێغەمبەری خوداﷺ باسی خەڵکانێکی کردووە لە ئوممەتەکەی کە لە کۆتایی زەماندا دەردەچن، وە باسی چەند نیشانەیەکیشی کردوون بۆ ئەوەی موسڵمانان بیان ناسنەوە، ئێمە لێرەدا ئەم نیشانانە باس دەکەین و بەراوردیان دەکەین لەگەڵ سەلەفیەکانی ئەم ڕۆژگارە:

نیشانە و صیفەتی یەکەم/ لە کۆتایی زەمان دەردەچن: بەڵێ ئێستا زۆرێك لە نیشانەکانی کۆتایی زەمان هاتوون، بە شێوەیەك نیشانە بچوکەکان ئەوەندەیان نەماوە هەموویان بێن.

نیشانە و صیفەتی دووەم/ خەڵکانێکی گەنج و تازە پێگەیشتوون: (**أحداث الأسنان**) بەڵێ زۆرینەی ئەوانەی شوێنکەوتەی سەلەفیەکانی ئەمڕۆن لە چینی گەنجانن.

نیشانە و صیفەتی سێهەم/ کاتێك قسە دەکەن بە ئایەتەکان قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەرﷺ قسەدەکەن: (**يقولون من خيرِ قولِ**

البَرِيَّة)، بەڵێ سەلەفیەکانی ئەمڕۆ هەر قسەیەك بکەی داوای بەڵگەی قورئان و سوننەتت لێدەکەن و پشتیان کردوتە بەڵگەکانی تری شەرع.

نیشانەو صیفەتی چوارەم/ زۆر گرنگی بە چۆنیەتی قورئان خوێندن و نوێژ کردن ڕۆژو گرتن دەدەن، بە شێوەیەك کاتێك قورئان دەخوێنن یان نوێژ دەکەن یان بەڕۆژو دەبن " ئەوە قورئان خوێندن و نوێژ کردن ڕۆژو گرتنی خۆت لەبەر چاو دەکەوێت: (يَخرجُ قومٌ مِنْ أُمَّتي يَقْرَءونَ القُرآنَ لَيس قِراءَتُكُم إلى قِراءَتِهم بِشَيءٍ وَلا صَلاتُكم إلى صَلاتِهم بِشَيءٍ وَلا صِيامُكُم إلى صِيامِهِم بِشَيءٍ) بەڵێ سەلەفیەکانی ئەمڕۆ ئاوهان و ئەمەش شتێکی بینراوە.

نیشانەو صیفەتی پێنجەم/ لە ڕوژ هەلاتی مەدینە دەردەچن و نیشانەشیان ئەوەیە سەریان دەتاشن، جێگای ئاماژەیە پێشەوای سەلەفیەکان محمدی کوڕی عبدالوهاب سەرەتا لە مەدینە دەیخوێند، بەلام دوای ئەوەی بیرو بۆ چونە بیدعە و هەڵەکانی خۆی دەرخست ، لە لایەن ماموستاکانی خۆی و شێخ سەلمانی برایەوە ڕەددیان دایەوەو کتێبیان لەسەر نوسی، پاشان ئەویش بە ناچاری بەرەوە ڕۆژ هەلاتی مەدینە ڕۆیشت(چەند گوڵێك لەگوڵزاری ئیسلام:٣٣) وە ئێستاش بە ئاشکرا هەموو

کەسێکی بینا دەبینێت کە سەلەفیەکانی ئەمڕو زۆرینەیان سەریان دەتاشن!!

نیشانەو صیفەتی شەشەم/ ناوە ناوە دەر دەکەون بەڵام لە لایەن موسڵمانە ڕاستەقیەنکانەوە بەرهەڵستیان دەدرێتەوە و کۆتاییان پێدەهێنرێت: (**كُلَّما خَرَجَ قَرنٌ قُطِعَ**) ، هەر کەسێك شارەزایی مێژووی هەبێت دەزانێت کە سەلەفیەکان سەرەتا لە سەردەمی محمدی کوڕی عبدالوهاب پەیدا بوون و موسڵمانانی مەککەو خەلافەتی عوسمانیان بەکافر دانا، پاشان ماوەیەك ونبونەوە دواتر لە سەردەمی سەر و بەندی جەنگی جیهانی یەکەم سەریان هەڵدایەوەو دستێکی باڵایان هەبوو لە ڕوخاندنی خەلافەتی موسڵمانان، پاشان ماوەیەکی تر کپ بونەوە، دیسان لە دوای ساڵی ١٩٩١وە بەڕابەرایەتی ڕەبیع مەدخەلی لە کوەیتەوە سەریان هەڵدایەوە(سایتی ویکبیدیا، تیار مدخلی) و دەستێکی باڵایان هەیە لە تێکدانی یەك ڕیزی موسڵمانان. بەڵام من موسڵمانان دڵنیا دەکەمەوە کە دیسان کپ دەبنەوە، چونکە ئەمە پێغەمبەرﷺ هەواڵی دەربارە داوە: (**كُلَّما خَرَجَ قَرنٌ قُطِعَ**).

نیشانەو صیفەتی حەوتەم/شەڕی موسڵمانان دەکەن و واز لە کافر و بت پەرستان دێنن: (يَقْتُلُونَ أَهلَ الإِسلامِ وَيَدَعُونَ أَهلَ الأَوثانِ) بەڵێ لەم ڕۆژگارەدا سەلەفیەکان ئەم نیشانە و صیفەتەیان لە هەموو نیشانەکانی تر زیاتر تێدا دیارەو ئاشکرایە، بە شێوەیەك لە هەر شوێنێکی ئەم دوونیایە سەلەفی لێبێت ئەوە شەڕیان شەڕی موسڵمانانە و پشتیشیان کردوّتە بێباوەڕ و بێدینان، بۆ نمونە: کاتێك خەڵکی موسڵمانی میصر لە دژی حسنی مبارکی عەلمانی شۆڕشیان کرد، سەلەفیەکان پشتی حوسنی مبارکیان گرت و دژی شۆڕشی خەڵکی موسڵمانی میصر وە ستانەوە، بەشێوەیەك لە کوردستانەوە فتوای مبتدعی و منحریفی هەردوو زانای بەڕێز دکتۆر یوسف قەرزاوی و شێخ محمد حەسانیان کرد، وە شۆڕی موسڵمانانی میصریان بە دەرچون لە گوێڕایەڵی وەلی ئەمر ئەژمار کرد، بەڵام کاتێك هاو کێشەکە پێچەوانە بویەوە و عەلمانیەکانی میصر ئینقلابیان کرد دژی دەسەڵاتی شەرعی و قانونی دکتۆر محمد مورسی، ئەوا سەلەفیەکانی میصر بە ڕابەرایەتی حیزبی نوری سەلەفی پشتیوانی ئینقلابەکەیان کرد،وە وەلی ئەمری سەلەفیەکانیش ئال سعودی شای سعودیە سەد و پەنجا ملیۆن دۆلاری

وەك شاباش و دەستخۆشانە بۆ ڕوخاندنی دەوڵەتی مورسی دا بە حیزبی نوری سەلەفی!! (بڕوانە: دووبارە بوونەوەی مێژوو: ٢٦) وە ئێستاشی لەگەڵدا بێت وەلی ئەمری سەلەفیەکان شای سعودیە ناوە ناوە بە ملیۆنەها و ملیارەها دۆلار یارمەتی دارایی بۆ ئینقلابچیەکانی میصر دەنێرێت، وە جێگای ئاماژەشە ئەم سەلەفیانە لە سەردەمی حوسنی ناموبارەکیشدا بۆ دژایەتی إخوان و موسڵمانەکانی تری میصر لە لایەن ناموبارەکەوە بەکار دەهاتن(بڕوانە: دووبارە بوونەوەی مێژوو: ٢٦)، وە دیسان جێگای باسە کە سەلەفیەکان لە جەنگی جیهانی یەکەمدا بە سەرکردایەتی ابن سعود چونە پاڵ بەریتانیەکان و دەستێکی باڵایان هەبوو لە پەرت کردنی یەك ڕیزی موسڵمانان و ڕوخاندنی خەلافەتی ئیسلامی(بڕوانە: تەوژمی فکری سیاسی وەهابی: ١٨٣و١٩٠) وە لە کوردستانی خۆشمان سەلەفیەکان بە شێوەیەکی ئاشکرا شەڕیان شەڕی موسڵمانانە، جا ئەم شەڕەشیان لە نوسین و کتێب و کەناڵەکانیانەوە ڕاگەیاندوە بەرامبەر حیزبە ئیسلامیەکان و شوێنکەوتوانی چوار مەزهەبەکە و ئەهلی تەصەوف، کە موسڵمانانی کوردستانیش لەم حیزب و مەزهەب و طـەریقەتانەدا ڕەنگدەدەنەوە. لە بەرامبەریشدا بۆ دەرمانی چاو ئێشەش باسی حیزبە

عەلمانیەکان ناکەن، وە کاتێك باسیشیان دەکەن بۆ ئەوە باسیان دەکەن کە خەڵك هان بدەن شوێنیان بکەوێت، چونکە بە خەڵکی دەڵێن: ئەوانە وەلی ئەمری شەرعی موسڵمانانن!!

﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُولِي الْأَبْصَارِ﴾



## کۆتایی

اللهمَ لَكَ الحَمدُ حتى تَرضى، وَ لَكَ الحَمدُ إذا رَضِيتَ، و لَكَ الحَمدُ بعد الرِضى، و صلِّ و سلِم على حبيبك المصطفى، و على آلهِ و أصحابهِ و مَن والاه.

له کۆتایی ئەم نوسینەدا دەڵێم ئەی خودای پەروەردگار ئەوەی لەسەر شانی من بوو ڕام گەیاند، جا هیدایەتیش لە دەست تۆدایە، وە ئەگەر تاکە کەسێك بە هۆی ئەم نوسینەوە هیدایەت وەربگرێت و واز لە غەیبەت و کێشە نانەوە و بە موشریك دانان و بیدعیەچی دانانی موسڵمانان بێنێت ئەوە بۆ من بەسە، چونکە پێغەمبەرە ڕێزدارەکەت ﷺ دەفەرموێت: (لأنْ يَهدِيَ اللهُ بِكَ رَجُلاً واحِداً خَيرٌ لَكَ مِنَ الدُّنيا وَما فِيها)(بوخاری و مسلم گێراویەتەوە) واتا: ئەگەر تەنها تاکە کەسێك بەهۆی تۆوە ڕێنمونی وەربگرێت ئەوە بۆ تۆ لە دونیا و لەوەیش لە دونیادا هەیە باشترە. وە من لێرەوە دەڵێم برایانی سەلەفی بزانن کە ئێوەش مرۆڤن، چۆن مرۆڤەکانی تر شیاوی هەڵەن ئێوەش شیاوی هەڵەن، ئەگەر موسڵمانانی تر بیدعە بکەن ئەوە ئێوەش پشکی شێرتان بەرکەوتووە لە بیدعەدا، جا لەگەڵ ئەوەشدا وەرن ناوی خودای لێبنن و واز بێنن لە

بیدعەکانتان و چیتر دوژمنایەتی موسڵمانان و دۆستایەتی بێدینان مەکەن، با هەمووماندەست لە ناو دەست و پشتیوان لە خودا هەوڵ بدەین ئیسلام بێنینەوە سەر حوکم ، دوای ئەوەی ان شاءالله ئیسلام گەڕایەوە بۆ سەر حوکم ئەو کات هەمومان بەیەکەوە و بە شاهیدی ئەهلی تەرجیح دادەنیشین و بەڵگەکانمان دەخەینە ڕوو، ئەو کات دەریدەخەین ئاخۆ کاممان لەسەر حەقین، بەڵام با لە ئێستادا هەموو تواناکانمان بخەینە کار بۆ گێڕانەوەی حوکمی ئیسلام، پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (إِن الدِّينَ يُسرٌ ،وَلن يَشادَّ الدينَ أحدٌ إلَّا غَلبهُ، فَسدِّدوا وقاربوا)(بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە) واتا: بەڕاستی ئەم دینە ئاسانە، ئێوەش توندی مەکەن، چونکە هەر کەسێك ئەم دینە بە توندی بگرێت بەرەوستی نایەت و دینەکە بەسەری دەکەوێت، جا ئێوەش ناوەندگیر و میانڕەو بن و لێك نزیك ببنەوە.

دەبا ئێمەش هەموومان لێك نزیك ببینەوە و چیتر پیلانی عەلمانیەکان لەسەر خۆمان جێبەجێ نەکەین کە دەڵێن: (فرق تسود) ئیسلام تەفرەقە بکەن و بیکەنە گروپ گروپ و تاقم تاقم ئەو کات قازانج دەکەن.

و صل الله علی سیدنا محمد و علی آله و صحبه أجمعین

ناوەڕۆك

ناوەڕۆك